


# ئەحکامی







# ڕاو

# و






# حەیوان سەر بڕین




نرخی ٤٠٠ تمەنە

# ئەحکامی
# راوکردن، وحەیوان سەر برین
## و
## باسی ئەو حەیوانانەی گۆشتیان
## ئەخورێ وە یان ناخورێ

بەگوێرەی حورروفی
ئەلف و بێ

دنراوی:
مەلا مەحمودی ابن الخیاط (سەقز)

ناوی کتێب : ئەحکامی ڕاوکردن و حەیوان سەربڕین
دانراوی : مەلا مەحموودی ابن الخیاط
نەوبەتی چاپ : یەکەم
هەژمار : ۳۰۰۰
چاپخانە آینده
پیت چنی : ئەحمەد ، ☎ ۵۴۱۰۱
ناشر : انتشاراتی کوردستان
شابک ۲ - ۴۱ - ۶۵۴۶ - ۹۶۴
ISBN: 964 - 6546 - 41 - 2
قیمت : ۴۰۰ تومان

## بە ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

لە پاش سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری میهرەبان، وە درووود و سەلام بۆ گیانی پیرۆزی پێغەمبەران، بە تایبەت ڕەهبەری گەورەی ئاخر زەمان، حەزرەتی موحەممەد(ص) عەرزم ئەمەیە:

باسی ڕاو و حەیوان سەر بڕین بە تایبەت ناسینی ئەو حەیوان و گیان لە بەرانەی گۆشتیان ئەخورێ بۆ موسوڵمانان زۆر پێویستە، وە هەر وەکوو دەزانین حوکمی شەرعی زۆر گیان لە بەر نازانین کە ئایا گۆشتیان ئەخورێ یان ناخورێ، بەو بۆنەوە بە پێویستم زانی لە سەر ئەم بابەتە باسێک بنووسم، وە بۆ ئەم کارە پەنام برد وە بە چەن سەر چاوەی باوڕ پێ کراو کە لە پاشا ناویان دەبەم، وە بە شێوەی خوارەوە دەس دەکەم بە نووسینی

بەشی یەکەم: ڕاو کردن، وە مەرجەکانی ڕاوچی...

بەشی دووەم: حەیوان سەر بڕین

بەشی سێهەم: ئەوگیان دارانەی گۆشتیان ئەخورێ وە یا گۆشتیان ناخورێ بە تەرتیبی پیتەکان دەیان نووسم، بەم جۆرە: ناوی گیان دارە کە بە کوردی و فارسی و عەرەبی، خۆ وڕە وشت وە حوکمی شەرعی ئەو حەیوانانە کە گۆشتیان ئەخورێ یان ناخورێ وە زۆرشتی دیکە دەنووسم.

مەحموود (ابن الخیّاط) دانیشتووی لەگزی

## بەشی یەکەم

## باسی ڕاو کردن (صَیْد)

(ڕاو) بریتیە لە هەوڵدان بۆ گرتن یا کوشتنی گیاندارێک کە گۆشتی بخورێ لە دەشت یا لە ئاوا. ڕاو کردن بە حوکمی شەریعەت مەباح ورەوایە خودا لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: «أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ و طَعامُهُ مَتاعاً لَكُمْ وَ لِلسَّيّارَةِ وَ حُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ ما دُمْتُمْ حُرُماً» (مائدە / ٩٦)

واتـا: حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە، ئەی موسوڵمانان، نەچیری دەریا و خواردەمەنی دەریا لەوەی کەوتبێتە سەر ئاو یا خود ڕۆچووبێ لە بەر لەزەت وەرگرتنتان لەو نەچیر و خواردەمەنی دەریایە بۆ ئێوە کە نیشتەجێ بن وە بۆ کاروانیتان خواە لە ئێحرامدا بن یا لە ئێحراما نەبن. وە حەرام کراوە لە سەرتان نەچیری وڵاتی وشکان مادام لە ئێحرامدا بن.

## (ڕاو کردنی حەڕام)

ئەو ڕاو کردنەی کە مەباح و ڕەوایە ئەوەیە کە ئامانج لەو نەچیرە سەربڕین و خواردنی بێ، ئەگەر وانەبی ڕاوچی گیاندارەکە لە ناو ببا و قازانجی لێ نەبات ئەوە ئەو ڕاو کردنە حەڕام و ناڕەوایە، لەم بارەوە پێغەمبەری گەورەی ئیسلام فەرموویەتی: «هەرکەسێک بە فیڕۆ چۆلەکەیەک بکوژێ، لە دوا ڕۆژدا ئەو چۆلەکە لە لای خودا سکاڵا دەکات و دەڵێت: ئەی خودای گەورە فلانی منی بە فیڕۆ کوشت بێ ئەوەی قازانجێکی لێم بردبێ = مَنْ قَتَلَ عُصْفُوراً عَبَثاً عَجَّ إِلَى اللهِ يَوْمَ الْقِيامَةِ يَقُولُ: يارَبِّ إِنَّ فُلاناً قَتَلَنِي عَبَثاً وَ لَمْ يَقْتُلْنِي مَنْفَعَةً». ترجمة فقه السنّة ج ٤ ص ٢٤٣٣.

## (مەرجەکانی ڕاوچی)

ئەو کەسەی کە ڕاودەکات بۆ ئەوەی نەچیرەکەی حەڵاڵ بێت پێویستە

موسولمان، یان ئەهلی کتێب بێت (کەوابە نەچیری جولەکە وگاور حوکمی سەر بڕاوی ئەوانی هەیە، بە هیوای خودا لە باسی سەربڕیندا ڕوونی دەکەینەوە

## (ڕاو کردن بە هۆی چەکی تیژ و حەیوانەوە)

کاتێ ڕاو بە هۆی چەکی تیژ و بڕین کەرەوە ئەبێ وەکوو: ڕم و شمشێر و تیرو کمان و وێنەی ئەمانە. خودا فەرموویەتی: «یا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا لَیَبْلُوَنَّکُمُ اللَّهُ بِشَیْءٍ مِنَ الصَّیْدِ تَنَالُهُ أَیْدِیکُمْ وَ رِمَاحُکُمْ». واتا: ئەی کەسانێ کە ئیمانتان هێناوە بە دینی ئیسلام بە ڕاستی خودا بەراوردتان ئەکا بە شتێکی کەم لە نەچیر کە لە کێوەکانەوە دێنە خوارەوە بۆ بەردەستان بە نەوعێکی وەها کە دەستان و ڕمتان پێیان ئەگات. (مائدە / ٩٤)

وە کاتێک ڕاو بە هۆی حەیوانەوە ئەبێ، خودا فەرموویەتی: «یَسْأَلُونَکَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَکُمُ الطَّیِّبَاتُ وَ مَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُکَلِّبِینَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَکُمُ اللَّهُ فَکُلُوا مِمَّا أَمْسَکْنَ عَلَیْکُمْ وَ اذْکُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَیْهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِیعُ الْحِسَابِ» واتا: پرسیارت لێ ئەکەن چ گۆشتێ ڕەوا کراوە بۆ ئێمە، تۆ بڵێ پێیان حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە هەر خواردەمەنیەک کە بە لەززەت بێ و تەبیعەتی سەلیم وەری بگرێ و بە شتێکی خراپی نەزانێ، وە نەچیری ئەو دڕندەو پەلەوەرە ڕاوکەرانە کە تالیمتان کردوون لە حەیوان و پەلەوەری بڕینکەر وەکوو: سەگ و، تانجی و، بازو.. غەیری ئەمانەیش کە تالیمتان کردوون لەوەی کە خودا تالیمی ئێوەی کردوە. واتە بەو یاساکە ئێوە فێربوون و بە ڕاوردتان کردوە تالیمتان داداون، دەی بخۆن لە گۆشتی ئەو نەچیرەی کە گرتوویانە بۆ ئێوە و نە یا نخواردوە. بەڵام لە کاتی بەرەڵڵا کردنی ئەو حەیوانە ڕاو کەرانەدا ناوی خودا ببەن (بِسْمِ اللّٰه) بکەن، وە یا ئەگەر بە زیندوویی گەیشتن بەو نەچیرانە سەریان ببڕن و (بِسْمِ اللّٰه)یان لە سەر بکەن، لە خودا بترسن و دوور بکەونەوە لە وەی کە خودا حەرامی کردوە، بە ڕاستی خودا حسێبی تاوان باران بە پەلە ئەکات. (سورە مائدە / ٤)

وە لە (أَبُو ثَعْلَبَةُ خشني) وەگێڕاو یانەتەوە کە گوتی ئەی پێغەمبەری خودا من لە شوێنێکا ئەژیم حەیوانی ڕاوی هەیە، وە من بە تیروکەمان و، بە هۆی سەگی فێرە ڕاو (مُعَلَّمْ)، وە سەگی تالیم نەدراو (غَيْرَ مُعَلَّمْ)،وە ڕاو ئەکەم، خواردنی گۆشتی کام نەچیرێکی بۆم حەلاَّڵە؟ پێغەمبەر فەرمووی: «مَا صِدْتَ بِقَوْسِكَ فَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلْ وَ مَا صِدْتَ بِكَلْبِكَ غَيْرَ الْمُعَلَّمِ فَأَدْرَكْتَ ذَكَاتَهُ فَكُلْ» واتا: گۆشتی نەچیرێک کە بە تیروکەمان ئەپێکیت وە لە کاتی تیر هاوێشتندا ناوی خودات لێ هێنا بخۆ، وە گۆشتی نەچیرێک کە بە هۆی سەگی تالیم نەدیو کوشتبوت ئەگەر پیاگەیشتی و سەرت بڕی لەویش بخۆ.

## (مەرجەکانی ڕاوکردن بە تفەنگ)

بۆ ڕاوکردن بە چەک و تفەنگ ئەم مەرجانەی خوارەوە پێویستە:
یەکەم: ئەمەیە گوللە کە ئەندامی حەیوانەکە ببڕێ و زاماری کات بە جۆری بەو زامە بمرێ واتە بە تیژی گوللەکە بمرێ نەک بە هێز و قورسایی گوللەکە گێراویانەتەوە، کە عەدی کوڕی حاتەم (خ) گوتی: ئێمە ئەومێکین کە بە تیر ڕاو دەکەین، چشتێ بۆمان حەلاَّڵە؟ پێغەمبەری نازدار (ص) گوتی: «يَحِلُّ لَكُمْ كُلُّ مَا ذَكَيْتُمْ وَ مَا ذَكَرْتُمْ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ فَخَزَقْتُمْ فَكُلُوا». واتا: هەر گیاندار و حەیوانێک کە سەرتان بڕی، وە هەر حەیوانێک کە بە تیر پێکاتان وە لە کاتی تیر هاوێشتندا ناوی خوداتان لێ هێنا و حەیوانەکەتان بریندار و زامار کرد ئەوە لێی بخۆن وە بۆتان حەلاَّڵە.
زانای بە ناوبانگ (شوکانی) فەرموویەتی: لەم ڕیوایەتەوە دەر ئەکەوێ کە ئەوەی پێویستە و لە بەر چاو ئەگیرێ بریندار کردن و کون کردنی لەشی حەیوانەکەیە، ئەگەر چی ئەو گوللەیش کە گیاندارەکەی کوشتوە قورسیش بێ، کە وابوو ڕاوکردن بە هۆی تفەنگی باروتی و گوللەی سوربی حەلاَّڵە، لە بەر ئەوەی گوللەی سوربی زیاتر لە تیرەکانی دیکە زام و برین بە دی دێنی و، لەشی حەیوانەکە کون دەکات، کەوایە حوکمی تیرەکانی دیکەی

هەیە، وە هەر کاتێک ڕاوچی لە کاتی تیر هاوێشتندا ناوی خودای لێ هێنا، وە نەیش گەیشتە سەر حەیوانەکە سەری ببڕێ گۆشتەکەی هەر حەڵاڵە.

وە ئەمما ئەوەی کە گوتویانە نەهی کراوە لە خواردنی گۆشتی نەچیرێک کە بە گوللە «بُنْدُقَة» کوژرابێ و، سەر نەبڕابێ وە ئەو نەچیرەیان لە وێنەی گۆشتی گیانلەبەرێ کە لە ژێر لێداندا مردبێ «مَوْقُوْذَة» ژماردوە، ئەبێ بزانین مەبەست لەو گوللە تفەنگی باروتی و گوللەی سوربی نیە، بەڵکو مەبەست گوللەیەک بووە کە لە گڵ دروستیان دەکردو، وشکیان دەکردەوە، وە ڕو بەڕووی حەیوانی ڕاوی ئەیان هاوێشت، ئەم جۆرە گوللە لە گەڵ گوللەی باروتی و سوربی فەرق و جیاوازیان هەیە.

ئیسلام چۆن نەهی کردوە لە خواردنی گۆشتی حەیوانێک کە بە گوللەی گڵی کوژرابێت هەروەها نەهیشی کردوە لە خواردنی گۆشتی حەیوانێک کە بە بەرد و گۆچان و ئەو جۆرە شتانە مردبێ.

لە بارەی هۆی ئەم ڕەوانە بوونەوە پێغەمبەر فەرموویەتی: «إِنَّهَا لاَ تَصِيدُ صَيْداً وَلاَ تَنْكَأُ عَدُوّاً لَكِنَّهَا تَكْسِرُ السِّنَّ وَ تَفْقَأُ الْعَيْنَ» واتا: ئەو گوللە گڵیانە نە نەچیری پێ ڕاو دەکرێ و نە دوشمنی پێ کوڵەوار دەکرێ، بەڵام بە پێچەوانەوە دوور نیە کە ددانی کەسێ بشکێنێ یا چاوی دۆستێ کوێر بکا!

هەروەها گۆشتی حەیوانێک کە بە شتێکی قورس یا هێزی گۆچان و، ئەو جۆرە شتانە کوژرابێ حەرامە مەگەر ئەوەی ڕاوچی بگاتە سەری وە حەیوانەکە زیندوو بێ و، سەری ببڕێ. لە حەدیسی عەدی کوڕی حاتەمدا هاتووە کە گوتی: پرسیارم لە پێغەمبەر کرد و گوتم من بە تیرە کوڵە (مِعْرَاض) ڕاو دەکەم (حوکمی چی یە)؟ پێغەمبەر فەرمووی: «إِذَا رَمَيْتَ بِالْمِعْرَاضِ فَخَزَقَ فَكُلْ وَ إِنْ أَصَابَهُ بِعَرْضِهِ فَلاَ تَأْكُلْ» واتا: ئەگەر تیرە کوڵەت گرتە نەچیر تێی هەڵچەقی و زاماری کرد ئەوە بیخۆ، ئەگینا ئەگەر لە سەر باری پانی گرتی ئەوە مەیخۆ.

دووەم: ئەمەیە، ئەبێ ڕاوچی لە کاتی تیرگرتن لە حەیوانی ڕاوی ناوی خودا بێنێ، وە پێشەوایانی زانیاری شەریعەت لەم بارەوە جیاوازیان نیەو

هەموو لە سەر ئەوەن ناو هێنانی خودا لە کاتی ڕاو کردن و تیر هاوێشتن‌دا کارێکی شەرعی و چاکە، لە بەر ئەو فەرمودەی کە لە پێشا لە ئەبوو ئەعلە بەوە گێڕامانەوە، وە زۆر فەرموودەی دیکە کە لەم بارەوە هاتوون.

بەڵکو جیاوازیان لەوا هەیە کە ناو هێنانی خودا لەو کاتەدا مەرجی حەڵاڵ بوونی نەچیرەکەیە، وە یا مەرج نیە.

ئەبوو ئەورو شەعبی و داوود زاهیری و زانایانی حەدیس (بِسْمِ اللهْ) گوتن و ناوی خودا هێنانیان لەو کاتەدا بە مەرجی حەڵاڵ بوونی نەچیرەکە زانیوە، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش هەر لە سەر ئەو قەولەیە.

پێشەوا ئەبوو حەنیفە، فەرموویەتی: ئەگەر لە یادی بێ ناوی خودا نێنێ و بە قەستی تەرکی کات ئەوە گۆشتی ئەو نەچیرە حەرامە، بەڵام ئەگەر لە یادی نەبوو ئیشکالی نیە و نەچیرەکە حەڵاڵە.

پێشەوا شافیعی وە تاقمێ لە (مالکیە) فەرموویانە: هێنانی ناوی خودا سوننەتە ئەگەر ڕاوچی بە قەستیش ناوی خودا نەهێنی نەچیرەکە هەر حەڵاڵە.

## (مەرجەکانی ڕاو کردن بە حەیوانی ڕاوی)

ڕاو کردن بە هێزی حەیوانەوە وەکوو: بازو شاهین و پڵنگ و سەگی ڕاوی، وە وێنەی ئەمانە کە فێرە ڕاو دەکرێن بەو مەرجانەی خوارەوە دروستە:

یەکەم: حەیوانەکە فێرە ڕاو کرابێ، وە نیشانەی فێرە ڕاو بوونی ئەوەیە بە قسەی خاوەنەکەی بڕوا و بگەڕێتەوە و بوەستێ وە ئینسان لەو باوەڕەدا بێ کە هەرگیز لە فەرمانی خاوەنەکەی دەرناچێ.

دووەم: ئەوەیە حەیوانەکە کە نەچیرەکەی گرت هیچی لێ نەخوا تا ئەیگەیەنێتە بەر دەستی کابرای ڕاوچی یا ئەو پێ ئەگات.

کەوابوو ئەگەر لێ خوارد ئەوە باقیەکەیشی بۆ خۆی ڕاگرتووە نەک بۆ خاوەنەکەی وە ئەگەر نەچیرەکە مردێت گۆشتەکەی حەڵاڵ نیە، لە حەدیسی عەدی کوڕی حاتەمدا هاتووە کە پێغەمبەر (ص) بە ئەوی

فەرموو: «إِذَا أَرْسَلْتَ كِلَابَكَ الْمُعَلَّمَةَ وَ ذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَيْهَا فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ وَ إِنْ أَكَلَ الكَلْبُ فَلَا تَأْكُلْ فَإِنِّيَ أَخَافُ أَنْ يَكُونَ مِمَّا أَمْسَكَ عَلَىٰ نَفْسِهِ» واتا: هەر کاتێک سەگە تالیم دراوە کانت بەردا گیانی نەچیروە ناوی خودات لێ هێنا بخۆ لەو نەچیرەی کە سەگەکان هیچیان لێ نەخواردوە (ئەگەر ڕاو چییەکە بە زیندویی پیا گەیشت ئەبێ سەری ببڕ ێ، ئەگینا گرتنەگەی لە جێی سەر بڕینەکەیەتی و خواردنی حەلاڵە. ئەوەندە هەیە ئەگەر بە سەگ گیرابوو ئەبێ جێگە دەمی سەگەکە گلاو بکرێ.)

بەلام ئەگەر سەگەکە یا هەر حەیوانێکی دیکە کە فێرە ڕاو کراوە لێ خوارد (وە ڕاوچیش پیا نەگەیشت سەری ببڕێ) ئەوە مەیخۆ لە بەر ئەوەی لەم حاڵەدا مەترسی ئەوەم هەیە بۆ خۆی ڕای گرتبێ نەک بۆ تۆ

سێهەم: ئەبێ ڕاوچی کاتێ حەیوانی ڕاوی خۆی بەردا گیانی نەچیرەکە ناوی خودا بێنێ، پێشتر لە بارەی (بِسْمِ اللهِ) گوتن و ناوی خودا هێنانەوە باسمان کرد، ئەمما مەبەست و ویستی بەرەڵلا کردن و بەردانی حەیوانی ڕاوی بە دوای نەچیردا یەکێکە لە مەرجەکانی ڕاو کردن، کە وابوو ئەگەر حەیوانە ڕاوەکە لە خۆیەوە ڕۆیشت بێ ئەوەی خاوەنەکەی بەری داتە گیانی نەچیرێک، وە نەچیری کوشت وە نەچیرکە لە ژێر دەستیا مرد بە فەرموودەی شافیعی و ئەبوو ئەور و خاوەن بیران خواردنی گۆشتی ئەو نەچیرە حەرامە، لە بەر ئەوەی ڕاوی بۆ خۆی کردوە و ڕای گرتوە بە بێ ئەوەی ڕاوچی ئەوی بەرداتە گیانی نەچیرەکە، وە ڕاوچی لەم ناوەدا هیچی نەکردوە و، بە نەچیری ئەو حەسێب ناکرێ، چونکە وە بەر حەدیسی پێشوو ناکەوێت کە لە پێشا باسمان کرد وە ئەوەی ئەگەیاند ئەگەر حەیوانی ڕاوی لە لایەن ڕاوچییەوە بەر نەدرێتە نەچیر ئەم حوکمەی نیە.

عەتا و ئەوزاعی گوتوویانە: ئەگەر حەیوانی ڕاوی فێرە ڕاو بووبێ، وە بۆ ڕاو بڕوات و، نەچیر لە ژێر دەستیا بمرێ بەلام لێ نەخواردبێ حەلاڵە.

## (هاوبەشی دوو حەیوانی ڕاوی لە ڕاوکردندا)

هەرکات دو حەیوانی ڕاوی لە ڕاوکردندا هاوبەشیان کردو، نەچیرێکیان کوشت ئەوە نەچیرەکە حەڵاڵە بەو مەرجەی هەر دوو حەیوانەکە لە لایەن خاوەنەکانیانەوە بەردرابێتنە نەچیرەکە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان خاوەنەکەی بەری دابێتە گیانی نەچیرەکە وە ئەوی دیکەیان لە خۆوە کەوتبێتە دوای نەچیرەکە لەم حاڵەدا ئەو نەچیرە کە گرتوویانە و لە ژێر دەستیانا مردوە حەرام و ناڕەوایە چونکە پێغەمبەر (ص) فەرمووی: «فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَىٰ كَلْبِكَ وَ لَمْ تُسَمِّ عَلَىٰ غَيْرِهِ» واتا: ئەوە نیە تۆ لە کاتی بەردانی سەگی ڕاوی خۆتا (بِسْمِ الله)ت کردوە نەک لە کاتی بەردانی حەیوانەکەی دیکەدا.

## (ڕاوکردن بە سەگی ڕاوی جوڵەکە و گاور)

هەروەها ڕاوکردن بە سەگی تالیم دراو، وە باز و شاهین جولەکە وگاور ڕەوایە. بەو مەرجەی ڕاوچییەکە موسوڵمان بێ، یانی ئەگەر نەچیرەکە لە ژێر دەستی حەیوانە ڕاویەکەدا مرد وەکوو حەیوانی سەر بڕاوی ئەوان وایە و حەڵاڵە.

## (دۆزینەوەی نەچیر بە زیندوویەتی)

هەرکات ڕاوچی نەچیرەکەی بە زیندوویی و نیوە گیانی دۆزیەوە لە حاڵێکا گەروو و، قورقوڕاچکەی پچڕابێ و ورکی دڕابێ و ڕیخۆڵەی کەوتبێتە بەرپای بە بێ ئەوەی سەربڕینی پێویست بێ حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر تەواو زیندوو بێ ئەوە واجیبە سەری ببڕێ، وە بە بێ سەر بڕین گۆشتەکەی حەڵاڵ نیە.

## (دۆزینەوەی نەچیر لە پاش پێکانی بە گوللە)

هەرکاتێک ڕاوچی گوللەیێکی بۆ نەچیر خست و پێکای لە پاشان لە بەر چاوی وون بوو، لە دوایدا دۆزیەوە بەڵام مردبوو. بە سێ مەرج گۆشتی

ئەو نەچیرە حەڵاڵە.
یەکەم: لە پاش پێکانی گوللە کە بە هۆی لە کێو کەوتنە خوارەوە، وە یا کەوتنە ناو ئاو نەمردبێت، چونکە لەم حاڵەدا ڕێی تێدەچێ کە بە هۆی کەوتنە خوارەوە لە کێو یا خنکان لە ئاودا مردبێ نەک بە هۆی گوللەوە.
بوخاری و موسلیم لەعدی کوڕی حاتەم گێڕاویانە تەوە کە وتی: پێغەمبەر (ص) فەرموی: «إذا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فاذْكُرِ الله، فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ قُتِلَ فَكُلْ إلاَّ أنْ تَجِدَهُ قَدْ وَقَعَ فِي مَاءٍ فَإنَّكَ لا تَدْرِي الْمَاءُ قَتَلَهُ أَوْ سَهْمُكَ». واتا: کاتێ گوللەت بۆ نەچیر هاوێشت و تیرت تێ گرت ناوی خودای لێ بێنە، لەم حاڵەدا ئەگەر نەچیرەکەت بە مردوویی دیتەوە لە گۆشتەکەی بخۆ مەگەر ئەوەی کەوتبێتە ناو ئاو، وە لە ناو ئاودا بیدۆزیتەوە لەم حاڵەدا حەڵاڵ نیە گۆشتەکەی بخۆی لە بەر ئەوەی تۆ نازانی لە ناو ئاوەکەدا خنکاوە یا بە گوللەکەی تۆ مردوە.
دووەم: دڵ نیابێ کە نەچیرەکە بە گوللەی ئەو مردوە، وە شوێنەواری گوللەی یەکێکی دیکە، یا حەیوانی ڕاوی کەسێکی دیکەی پێوە دیار نەبێ، لە بەر ئەوەی عەدی کوڕی حاتەم گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا، کاتی وا ئەبێ گوللە دەگرمە نەچیرو، بۆ بە یانی نەچیرەکە ئەدۆزمەوە کە هێشتا گوللەکەی خۆمی پێوەیە، لەم حاڵەدا چی بکەم؟ پێغەمبەر فەرمووی: «إذا عَلِمْتَ أَنَّ سَهْمَكَ قَتَلَهُ وَ لَمْ تَرَ فِيهِ أثَرَ سَبُعٍ فَكُلْ» واتا: کاتێک بۆت دەرکەوت کە تیرەکەی تۆ کوشتوویەتی، وە شوێنی گیانلەبەری درندەی پێوە دیار نەبوو، ئەوە بیخۆ حەڵاڵە.
وە لە فەرموودەیێکی دیکەدا کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (ص): کە سێ تەقە لە نەچیرێ دەکا و شوێنی هەڵ دەگرێ و لە پاش دوو سێ ڕۆژ بە مردووی دەیدۆزێتەوە، کە هێشتا تیرەکەی ئەوی پێوەیە لەم حاڵەدا چی بکا؟ فەرمووی: ئەگەر بیەوی ئەتوانێ لی بخوا= «يَأْكُلُ إنْ شَاءَ».
سێهەم: نابێ نەچیرە کە خراپ بوویی و، بۆگەنی کردبێ، لە بەر ئەوەی لەم

حاڵەدا پیسەو، دڵ بێزی لێ ئەکاتەوە، وە زەرەر و زیانی هەیە. ئەبو ثەعلەبەی خشنی (خ) گوتی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (ص) ئەگەر کەسێ لە پاش سێ ڕۆژ نەچیری خۆی دۆزیەوە چی بکا، فەرمووی: «إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَغَابَ ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَ أَدْرَكْتَهُ فَكُلْهُ مَالَمْ يُنْتِنْ» واتا: کاتێ تیرت گرتە نەچیرەکە سێ ڕۆژ لی گەڕایت لە پاشا دۆزیتەوە (تا سێ ڕۆژ وون بوو)، ئەگەر بۆگەنی نەکردبوو بیخۆ.

## (بە هۆی ئەم شتانەی خوارەوە نەچیر دەبێتە ماڵی ڕاوچی)

یەکەم: بەوەی، بە دەستی خۆی نەچیرێک بگرێت دەبێتە ماڵی ئەو، بەو مەرجەی ماڵی کەسێکی دیکە نەبێ، بەو شێوە کە ڕەنگیان کردبێ یا باڵیان قرتاندبێ بۆ ئەوەی هەڵ نەفڕێ، یا حەڵقەیان کردبێتە گەردن یا گوێی ئەو گیاندارە.

دووەم: وە بەوەی کە نەچیرێک بریندار کات، بە جورێکی وەها ئەو گیاندارە بەو زام و برینە بمرێت ئەبێ بە ماڵی ئەو.

سێهەم: بەوەی کە زەوین گیری کات یا باڵی بشکێنێ وە لە ڕاکردن یا هەڵفڕینی بخات.

چوارەم: بەوەی داوڵی بڕات وە گیاندارەکە بێتە داوەکەوە، یا تەڵە بنێتەوە، یا تۆڕدانێ وە نەچیرەکە بگرێت.

پێنجەم: بەوەی گیاندارەکە بکات بە تەنگە بەرێکدا کە ڕێی هەلاتنی نەبێت، یا بێکا بە ماڵێکا، بەڵام ئەگەر ڕێی دەرچوونی بێت نابێ بە ماڵی ئەو، وە هەرکەسێکی دیکە بیگرێت ئەبێتە ماڵی ئەو.

ئەگەر دوو کەس پێکەوە نەچیرێکیان زامار کرد، ئەگەر دووهەمین کەس نەچیرەکەی کوشتبوو، وە یا زەوین گیری کردبوو نەک هەوەڵین کەسیان، ئەوە نەچیرەکە ئەبێتە ماڵی دووهەم کەس، بەڵام هاتوو هەوەڵین کەس حەیوانەکەی کوشت یا زەوین گیری کرد ئەوە ماڵی ئەمە.

## (پایە و مەرجەکانی ڕاوکردن بە کورتی)

**پایەکانی ڕاوکردن چوارن:**
١-ڕاوچی، ٢-نەچیر، ٣-ئامرازی ڕاو، ٤کوشتنی نەچیر،
**پایەی یەکەم: ڕاوچی ئەبێ،** الف: موسوڵمان یا کیتابی بێ.
ب: ئەهلی تمییز بێ.
ج: چاوساخ بێ.
د: لە ئیحرام وە یا لە حەرەمدا نەبێ.
**پایەی دووەم: نەچیر،** الف: ئەبێ گۆشتی بخورێ و حەڵاڵ بێ.
ب: نەچیرەکە زیندووبێ. ج: نەچیرەکە وەحشی (کێوی) بێ.
**پایەی سێهەم: ئامرازی ڕاوکردن کە چەن جۆرە:**
الف ـ دەست، داو، تۆڕ، تەڵە، کەمین، چاڵ، دەرمانی بێهۆش کەر.
کە لە هەموو ئەمانەدا سەربڕین پێویستە.
ب ـ چەکی دەستی وەکوو: شمشێر، کارد، خەنجەر، چەقۆ، داس، وە باقی ئۆک تیژەکان.
ج ـ چەک و ئەو ئەسڵەحەی کە ئەیگرنە نەچیر، وەکوو: تیر پەیکاندار، وە تیرە کۆڵە (مِعْراض)
د ـ ئەنواع چەک و تەقەمەنی بارووتی وەکوو: تفەنگ، دەمانچە بە گوللەی مسی یا وەرشەوی...
**پایەی چوارەم: کوشتنی نەچیر، کە ئەویش چەن مەرجی هەیە.**
الف ـ ئامانجی ڕاو کردن و پێکانی نەچیر.
ب ـ هێنانی ناوی خودا لە کاتی تیر خستندا.
وە یا حەیوانە کە بەرەڵڵا ئەکا و بەری ئەداتە گیانی نەچیر ناوی خودا بێنێ.

## بەشی دووەم، حەیوان سەربڕین (ذَبائح)

### پایەکانی حەیوان سەربڕین

**حەیوانْ سەربڕین چوار پایەی هەیە: ١ـ حەیوان سەربڕ (ذابِحْ) ٢ـ حەیوانە سەر براوەکە (ذَبیحَة) ٣ـ ئامرازی سەربڕین (آلات ذِبْح) ٤ـ سەربڕین (ذَبْح)**

**پایەی یەکەم ـ حەیوان سەربڕ (ذابِح)**

ئەو کەسەی حەیوانەکە سەر ئەبڕێ، ئەبێ ئەم مەرجانەی خوارەوەی تیا بێ. یەکەم: موسوڵمان بێ، یا لەو (کتابی) یانە بێ کە ژن لێ خواستنیان حەلاڵە وەک جولەکە و گاور بەو مەرجەی لە (بَنی ئیسرائیل) بن، یانێ لە بنەڕە تا هەر لە سەر ئەو دینە بووبێتن، جولەکەکان لە پێش پێغەمبەریی حەزرەت (عیسی) لە سەر دینی خۆیان بوویێتن، وە گاورەکان لە پێش پێغەمبەریی حەزرەت موحەممەد (ص)دا هەر لە سەر دینی گاوری بوویێتن. خودا لە قورئاندا فەرموویەتی: «وَ طَعامُ الَّذینَ اوُتُوا الکِتابَ حِلٌّ لَکُمْ وَ طَعامُکُمْ حِلٌّ لَهُم» واتا: وە خواردەمەنی ئەو کافرانە کە وەختی خۆی کتێبیان پێدراوە حەلاڵە بۆ ئێوە، گۆشت بێ یا غەیری گۆشت، بەم مەرجە سابت بووبێ کە ئەهلی کیتابن. وە خواردەمەنی ئێوەیش ـ ئەی موسوڵمانەکان ـ حەلاڵە بۆ ئەوان.

عالمە گەورەکان فەرموویانە جولەکە و گاوری ئەم زەمانە ئەو شەرتانەیان تیانیە و خواردنی گۆشتی سەربڕاوی دەستی ئەوان حەلاڵ نیە.

کە واتە حەرامە خواردنی گۆشتی حەیوانێ کە بتپەرست و حەیوان پەرست و ئاگر پەرست و کەسێکی لە دین هەڵگە ڕاو سەریان بڕیبێ.

**(گۆشتی حەیوانێک کە زەردەشتی و ستارەپەرست سەریان بڕیبێ)**

زاناکان لە بارەی گۆشتی حەیوانێک کە زەردەشتی سەری بڕیبێ

ناکۆکیان هەیە، زۆربەی زاناکان فەرموویانە: حەرامە لە بەر ئەوەی مەجووسی (مُشْرِکْ) شەریک بۆ خودا دانەرن، وە بازێ لە زاناکان فەرموویانە، حەلاڵە.

وە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: «سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ».

واتا: لە گەڵ مەجووسی وەکوو ئەهلی کیتاب ڕەفتار بکەن.

وە (ابن حَزم ظاهری) لە کتێبی (اَلْمُحَلّٰی)دا فەرموویەتی: زەرتوشتی ئەهلی کیتابن وە لە تەواوی بابەتەکاندا وەکوو کیتابی لە گەڵیاندا ڕەفتار ئەکرێ (المحلی ج ٧ ص ٤٥٦)

بەغدادی لە کتێبی (اَلْفَرْقُ بَيْنَ الْفِرَقْ)دا بە ئاشکرایی وتوویەتی: مەجووسی بە پێغەمبەری زەرتوشت ئیمانیان بووە، وە بازێ لە زانایانی ئیسلامی ئیمرۆژ وەکوو (مولانا ابو الکلام آزاد) پشتیوانیان لەم قسە کردووە.

خودا لە قورئاندا فەرموویەتی: «إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَ الَّذِينَ هَادُوا وَ الصَّابِئِينَ وَ النَّصَارَىٰ وَ الْمَجُوسَ وَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا إِنَّ اللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ» واتا: بە ڕاستی کەسانێ کە باوەڕیان هێنا بەوەی خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەر (مُحَمَّدْ) ـ ص ـ وە ئەوانەی کە جولەکەن، وە ئەستێرە پەرستەکان وە نەسرانیەکان کە ئێستا پێیان ئەوترێ گاور، وە مەجوسی یەکان کە دوو خوا بڕیار ئەدەن: خوای ڕووناکی و، خوای تاریکی، وە ئەوانە کە هاوبەشیان بۆ خوا ڕەوا داوە، واتە بتپەرستەکان، بە ڕاستی ئەم شەش تاقمە لە ڕۆژی دواییدا خوا حوکم و بڕیار ئەدا لە نێوانیاندا، جیاوازی ئەخاتە نێوانیان بە دەرخستن و، سەر خستنی ئەوانەی لە سەر حەقن و، ڕێگای ڕاستیان گرتووە بە سەر ئەوانەی کە لەم جیهانەدا بەتاڵ و، شتی پڕوو پوچو، ڕێگای چەوتیان داوەتە بەر، چونکە بێ گومان خوا ئاگادارە بە سەر هەموو شتێکا، وە شایەت و، چاودێرە لە سەر هەموو شتێ،

خاوەنی (تفسیری نمونه) لە بەرگی چواردە لاپەرەی ٢٤ دا، دەڵێ:

**مەجووس چە کەسانێکن؟**

مەجووس پەیڕەوانی زەرتوشت، لە بەر ئەوەی لە ئایەتەکەدا لە بەرامبەری (موشرکان)، وە لە ڕیزی دینە ئاسمانیە کاندا قەراری گرتووە، وا دەر ئەکەوێ کە ئەوانیش ئەهلی کتێبن و پێغەمبەریان بووبێ، مەشهور ئەوەیە کە زەرتوشت کتێبێکی بوە بە نێوی (ئاوێستا) کە لە کاتی سەرکەوتنی ئەسکەندەر بە سەر ئێراندا لە ناو چوە، وە لە دوایدا لە زەمانی بازێ لە پاوشایانی «ساسانی» دا نووسراوەتەوە...

حەسەنی عەمید لە فەرهەنگەکەیدا نووسیویەتی: زەرتوشتی نیسبەت ئەدرێ بەلای زەرتوشت. ئاینی زەرتوشتی: دینێ کە زەرتوشت پێغەمبەری باستانی لە نزیکەی حەوت سەدەی پێش زاین (میلاد عیسی)دا هێنای، وە لە زەمانی پاوشایانی «ساسانیدا» مەزهەبی رەسمی ئێرانیان بووە، زەرتوشتیان ـ اَهُورا مزدا ـ خوای یەگانە ئەپەرستن، بە دوارِۆژ و بەهشت و دۆزەخ ئیمانیان هەیە، سێ پایەی بایە خدار لە ئاینی زەرتوشتا هەیە:

بیری چاک، وتاری جوان، کردەوەی جوان، لە بەر ئەوەی زێزیان بۆ ئاگر داناوە بە ئاگر پەرست ناویان دەرکردوە، کتێبی مەزهەبی ئەوان ئاوێستایە (بە زبانی مادی یا کوردی نوسراوە) لە دوای سەرکەوتنی ئیسلام زۆرێ لە زەرتوشتیەکان لە سەر دینی خۆیان مانەوە کە تا ئێستایش بەرەکانی ئەوان لە ئێران و هیندوستاندا ماونەتەوە، وە مروڤێلێکی تێگەیشتوو و، پیاو چاک و فەرهەنگ ویستن.

دوکتۆر (وَهْبَةُ الزّحيلي) لە بەرگی دە لاپەرەی ١٧٦ تەفسیری (المُنير)دا گوتوویەتی: لە گەڵ مەجوسیشدا وەکوو ئەهلی کیتاب رەفتار ئەکرێ لە وەرگرتنی «سەرانە»دا. کوڕی مونزیر گوتوویەتی: لە وەرگرتنی «سەرانە = جِزْيَة» لە مەجوسی ناکۆکی بەر چاو ناکەوێت، ئیمامی مالک لە کتێبی (مُوَطّا)دا گێراویەتەوە، کە حەزرەت عومەری کوڕی خەتتاب باسی مەجوسی کرد گوتی: نازانم چبکەم لە گەڵ ئەواندا؟ لەو کاتەدا (عبدالرّحمن

بن عَوْف) گوتی: شاهیدی ئەدەم من خۆم لە زبانی پێغەمبەرم بیست کە ئەیفەرموو «سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ». کوڕی (عبدالبَر) فەرموویەتی مەبەستی تەنیا «سەرانە» بووە.

وە لەم فەرموودەدا بەڵگەیەکی ڕۆشن هەیە لە سەر ئەوەی مەجوسی ئەهلی کیتاب نین. ئەمما (صابِئِین)، ئەڵێن: هۆزێکی خواپەرست و یەگانە پەرستن، بەڵام بە کار تێکردن (تأثیر)ی ئەستێرەکان لە عالەمدا باوەڕیان هەیە. وە بە بازێ لە پێغەمبەرانیش ئیمانیان هەیە، بە نەزەری ئیمامی ئەبوو حەنیفە ئەوانیش ئەهلی کیتابن. (الحلال و الحرام دکتر یوسف قرضاوی)

دووەم: ئەوەیە ئەو کەسە کە حەیوانە کە سەر ئەبڕێ ئەهلی تەمیز و لە سەر هۆش بێ، یانی بزانێ چ دەکات وە بزانێ حەیوانە کە چۆن سەر ئەبڕێت، بۆ حەیوان سەربڕ (ذابِح) ئەم تەرتیبەی خوارەوە لە بەر چاو بگیرێت چاکە.

١ـ ئەگەر پیاو بێت، پیاوی موسوڵمانی ژیر ٢ـ ژنی موسوڵمانی ژیر ٣ـ منداڵی موسوڵمانی ژیر ٤ـ ئەهلی کیتاب ژن یا پیاو ٥ـ کوێر ٦ـ سەرخۆش و شێت ئەگەر دەرک و هۆشیان بێت.

ئەمانەی خوارەوەیش ئەتوانن حەیوان سەر ببڕن وە سەر بڕاوی دەستی ئەوان حەڵاڵە.

١ـ بەندە ٢ـ خراپەکار (فاسق) ٣ـ لەش پیس ٤ـ ژنێ کە لە بێ نوێژیدا بێ (حائِض) ٥ـ ژنێ کە لە خوێنی پاش منداڵ بوون و زستانیدا بێ (نفاس) ٦ـ لاڵ کە بە ئیشارە تێ بگات.

ئەگەر شێت و سەرخۆش و منداڵ کە ئەهلی تەمیز نەبێت بە تەواوی نەزانن کە چ دەکەن سەر بڕاوی ئەوان حەرامە، بەڵام ئەگەر هۆشیان بێ و بزانن چ دەکەن ئەوە سەربڕاوی ئەوان حەرام نیە. بەڵکوو هەر وەکوو سەربڕاوی کوێر کەراهەتی هەیە.

### پایەی دووەم: حەیوانە سەربڕاوەکە (ذَبیحَة)

پایەی دووەم: حەیوانە سەربڕاوەکە ئەمەیش دوو مەرجی هەیە:

یەکەم: ئەمەیە، حەیوانەکە گۆشتی بخورێ وە نیازی بە سەر بڕین بێ لەم بارەوە چاودێری ئەمانەی خوارەوە ئەبێ بکرێ:
١ـ حەیوانەکە خۆی، کەوایە سەر بڕینی غەیری حەیوانەکە مانای نیە. لەم بارەوە «خوری و موی حەیوانی زیندوو یا سەربڕاو بە دەستی موسوڵمان، ئەگەر بە هۆی مەجوسی‌یەوە کە ندراین پاکە وە ئەو حەیوانە بە هۆی ئەومەوە حەرام نابێ.
٢ـ حەیوانەکە حەڵاڵ بێ، کە واتە سەربڕینی کەر و هێستر لە گەڵ تۆپینەکەیاندا فەرق و جیاوازی نیە، یانی با سەریش بڕابێ هەر دەڵێن کەرە تۆپیو.
٣ـ نیازی بە سەربڕین بێ، کە واتە ماسی و کوللە سەر بڕینیان نابێ.
دووەم: ئەمەیە، حەیوانەکە لە کاتی سەربڕینیا گیانی تیابێ. جائەگەر حەیوانەکە نەخۆش بوو هەر ئەوەندە پێویستە کە گیانی تیابێ، وە نیشانەکەی ئەوەیە هەناسە بدات (حَیاةٌ مُسْتَمِرَّةٌ) إعانَةُ الطالِبِیْنَ ج ٢ ص ٣٤٧، ئەگەر ساغیش بوو ئەبێ گیانێکی جێ گرتوو (حَیاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ)ی تیابێ کە نیشانەکەی ئەوەیە جم و جوڵ و پەلە پەلێکی بە هێزی ببێ، یا خوێنی با زرەقە بەستێ، یا لە کاتی سەربڕینیا دەنگ لە قورگیەوە بێت و خوێنەکەی بە عادەتی بێت و بڕوات.
ئەگەر حەیوانەکە بە هۆی نەخۆشی یا برسیەتی کەوتە حاڵەتی گیان دەرچوون لەو کاتەدا، یانی لە کاتی دەرچوونی گیانیدا (حَیاةٌ یا حَرَکَةٌ مَزْبُوحٌ) کە بیستن و دیتنی نامێنێ و جم و جوڵی لە دەسەڵاتا نابێ، وە گیایەکی زەهراوی و کوشندەی نەخواردبێ کە بوو بێتە هۆی لە ناو چوونی، سەریان بڕی، هەر چەن جم وجوڵی کەم بێ یا خوێنەکەی کەم بازرەقە بەستێ حەڵاڵە. (اعانە ج ٢ ص ٣٤٧ ـ الفقە الأسلامی ج ٣ ص ٦٧٣)
بەڵام ئەگەر حەیوانەکە بە هۆی گیایەکی زەهراوی و زیان دەر نەخۆش کەوت کەمانی ئەستەم بێ و بگاتە دوا هەناسە بە قەولی زۆر لە زاناکان حەڵاڵ نیە، و بازێکیان فەرموویانە لەم حاڵەتەدا ئەبێ گیانێکی جێ گرتوو

(حَیَاةٌ مُسْتَقِرَّة)ی لە هەوەڵی سەر بڕینەکەدا تیابێ (الفقه‌الاسلامی ج٣ص٦٧٢- إعانةُ الطّالِبین ج ٢ ص ٣٤٨)

(بزانن) بە قەوڵی زۆر لە زاناکان، یەکێک لەو دوو نیشانانە کە بۆ گیانی جێ گرتوو بەیان کرا کە بریتی بوون لە جم‌و جوڵی بەهێز، وە بازرقە بەستنی خوێنەکە بۆ دڵنیا بوون لە زیندوو بوونی حەیوانەکە کافیە، وە ئەبێ جم‌و جوڵ و حەرەکەی حەیوانەکە لە دوای سەر بڕینەکە بێ نەک جم‌و جوڵی پێش سەربڕین.(هەر ئەو سەر چاوانەی ڕابردوو، وە هەمان لاپەڕە)

## پایەی سێهەم، ئامرازی سەربڕین:

بە هەر شتێکی تیژ حەیوانەکە سەربڕی دروستە، غەیری نینۆک و ددان، خوای چەقۆ بێ یا داس یا کەرەمتوو یا کارد یا شمشێر یا خەنجەر یا پارچە شوشەیەک یا بەردێکی تیژ یا قامیش و شتی وا.

پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: «مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَ ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عَلَيْهِ فَكُلُوهُ إِلاَّ مِنْ سِنٍّ وَ ظُفْرٍ، أَمَّا السِّنُّ فَعَظمٌ وَ أَمَّا الظُّفْرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ» واتا: هەرچی فیچقە بە خوێن بکا و لە کاتی سەربڕیندا خوێنەکە بازرەقە ببەستێ، وە ناوی خودای لێ ببرێ، بیخۆن، بە مەرجێ ئەو شتە ددان و نینۆک نەبێ پێشت بڵێم کە لە بەر چی دروست نییە شت بە ددان و نینۆک سەر ببڕێ چونکەددان ئێسکە و ئێسکیش کوڵە و تیژ نیە و بە زۆری مرداری دەکاتەوە نینۆکیش چەقۆی حەبەشەیی یەکانە. بە ڕیوایەتی ڕافیعی کوڕی خەدیج (تاج)

مەرجی ئامرازی سەر بڕین ئەوەیە تیژ بێ، یانی بە تیژی خۆی حەیوانەکە سەر ببڕێ نەک بە هێزی دەست یا بە هۆی شتێکی قورسەوە ملی حەیوانەکە بقرتێنێ، بە کورتی ئەگەر کەسێک بە هێزی تێشوو حەیوانێکی سەر هەڵکەند یان بە مشار ملی بڕییەوە ئەوە ئەو گیاندارە مردارەوە بوو و، حەرامە.

**پایەی چوارەم، «ذَبحْ» یانی سەربڕین.**

«تَذْکِیَة» یانی حەڵاڵ کردنی گۆشتی گیانداران، کە بە دوو شێوە دێتە جێ:

١-سەر بڕین ٢-زامار کردن، سەربڕین بۆ حەیوانێکە کە لە بەر دەستابێ و سەربڕینی ئاسان بێ. «سەربڕین» بریتی‌یە لە بڕینی هەموو قوڕقوڕاچکەی حەیوانەکە کە هەناسەی پیادێت و ئەچێ، وە هەموو سوورێنچکەی کەئاو و خواردەمەنی پیادێت و ئەچێ. ئەگەر یەکێک لەم دوو شوێنە بە تەواوی نەبڕرا، حەیوانەکە مردار بوەتەوە. بەڵێ هەندێ لە عالمانی دین فەرمویانە ئەو گرێ خڕەش کە لە نزیکی بنی زمانەوەیە بەشێکە لە قوڕقوڕاچکە و ئەگەر حەیوان لەویایشا سەر ببڕێ هەر دروستە وەک لە (تحفه)دا بەیان کراوە. (شەریعەتی ئیسلام ج ١ ص ٢٩٦)

(بـــزانـــن) بڕینی تەواوی قوڕقوڕاچکە و سوورێنچکەی حەیوان و گیاندارەکە پێویستە، ئەگەر شتێ لەو دوو شوێنە بمێنێتەوە و، نەبڕابێ گۆشتی ئەو حەیوانە حەڵاڵ نیە، وە ئەبێ نیوەی ئەو گرێ خڕەش کە لە نزیکی بنی زمانەوەیە، یان تەواوی یان لای کەمی ئاڵقەیەکی بکەوێتە لای سەری حەیوانە سەر بڕاوەکەوە، ئەگەر وانەبێ، واتا: ئەو گرێ خڕە بە تەواوی بکەوێتە لای لاشەی حەیوانەکە گۆشتەکەی حەرامە، چونکە بەوە ناڵێن سەربڕین بەڵکو ئەبێتە هوی لە ناو چوون و مردار کردنەوەی حەیوانەکە. (باجوری ج ٢ ص ٢٩٤ بە گێڕاندنەوەی تسهیل المسائل ج ٣ ص ٨)

مەرجی دووەمی سەربڕین، ئەمەیە حەیوان سەربڕەکە ئامانج و نییەتی حەیوان سەربڕینی بێ، کەواتە، ئەگەر چەقۆ، یان هەر شتێکی تیژ لە دەس ئینسان بەرەو بێتەوە و، بدات لە ملی حەیوانێک و سەری ببڕێ یان چەقویەکی تیژ بەبێ نییەتی پێکانی حەیوانەکە بە هەیبەت توور بدات و، لە ناکاو بدات لە ملی حەیوانێک و سەری ببڕێ یان شتێکی تیژ بە دەستیەوە بێ وە حەیوانێک ملی تێ بساوێت و ملی ببڕێ واتا: قوڕقوڕاچکە و سوورێنچکەی ببڕێ، یان حەیوانێکی ڕاوی لە دەستی دەرچێ و لە خۆیەوە

نەچیرێک بگرێ، یان بۆ تاقی کردنەوە گوللەیەک بۆ نیشانە بخات وە حەیوانێک بکوژێ لە تەواوی ئەم حاڵانەدا چونکە قەصدی کارەکە، یان پێکانی حەیوانەکەی نەبووە ئەو حەیوانە مردارەوە بوو و، حەرامە.(فقە محمّدی مردوخ ج ١ ص ١١٨ و مغنی المحتاج ج ٤ ص ٢٧٦)

ئەگەر حەیوانێک بە تەواوی سەر ببڕێ، واتا: قوڕقوڕاچکە و سوورێنچکەی قەطع بکرێ لە پاشان دەستی لێ هەڵبگرێت و، حەیوانەکە هەستێ کەمێک بڕوات و ڕابکات لە دوایدا بکەوێت و بمرێ، گۆشتی حەلاڵە.

دروستە سەر بڕینی حەیوانێک کە گورگ سکی دڕیبێ، هەر چەند ڕێخۆڵەشی دەر هاتبێ و لەوانەبێ لە پاش چەند دەقیقەیەکی تر بمرێ. دروستە لە کاتی سەربڕینا چەقۆ لە سەر ملی حەیوانەکە لابەیت و گورج بیخەیتەوە سەری، بەڵام ئەگەر دەستی لە سەربڕین هەڵگرت تا حەیوانەکە سارد بوەوە، ئەوجا چەقۆکەی نایەوە ملی و قوڕگی بڕی، ئەوە حەرامە.

ئەگەر حەیوان سەربڕ بە تێخێکی کول بەشێ لە قوڕقوڕاچکە و سوورێنچکەی حەیوانەکەی بڕی، وە بەبێ ئەوەی دەس لە سەر گەرووی لابات کەسێکی دیکە بە تێخێکی تیژ باقی قوڕقوڕاچکە و سوورێنچکەی حەیوانەکە بڕێ، ئەوە ئەو حەیوانە سەربڕاوە گۆشتی حەلاڵە، بێ جیاوازیە کە لە کاتی سەربڕینی شەخصی دووەم دا گیانی جێ گرتوو (حَیاةْ مُسْتَقِرَّةْ)ی بێ یان نەبێ.

(بزانن) لە نووسراوەی زانا شەرع زانەکاندا باسی سێ جۆر «حَیاةْ» کراوە:

١ـ(حَیاةْ مُسْتَقِرَّةْ) یانی ژیان، وە گیان لەبەرا بوون بە گیانێکی جێ گرتوو، وە هەمیشەیی بە جۆرێکی وەها ئەو گیاندارە ببینێ و ببیسێ و دەنگی بێ و، جمو جووڵی ئیختیاری ببێت نەک جمو جووڵی ناچاری.

٢ـ(حَیاةْ مُسْتَمِرَّةْ) زیندوو بوونێکە دەوام دێنێ تا دەرچوونی گیان لە بەدەن.

٣ـ(حَرَکَةْ یا عَیْشْ مَذْبُوحْ) زیندوو بوونێکە بینین و دەنگ و جمو جووڵی

ئیختیاری نامێنێ بەڵکو بینین و دەنگ و جمو جووڵێکی ناچاری ئەبێ.
وە هەندێک لە زانایان بەم جۆرە جیاوازییان خستوەتە نێوان ئەم سێ جۆرە ژیانەوە:
١ـ(حَيَاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ) ئەوەیە ئەگەر حەیوانەکە بە حاڵی خۆی بێلیتەوە یەک دوو رۆژێک بمێنێتەوە.
٢ـ(حَيَاةٌ مُسْتَمِرَّةٌ) ئەوەیە دەوامی بێ تاکۆتایی ئاکام (أَجَلْ)
٣ـ( حَرَكَةُ مَذْبُوحْ) ئەوەیە ئەگەر حەیوانەکە بە حاڵی خۆی بێلیتەوە دەس بە جێ بمرێ. (إعانَةُ الطَّالِبِينْ ج ٢ ص ٣٤٣)
هەروەکوو بەیان کرا سەربڕین بە بڕینی تەواوی قورقوراچکە و سوورێنچکەی حەیوانەکە تەواو دەبێ بەڵام بڕینی «وَدَجَيْنْ»: دوو ڕەگی دەورو بەری ملی حەیوانەکەیش بۆ ئەوەی زوو گیانی دەرچێت سوننەتە، ئیتر نابێ بە بڕینی مۆخ وشکاندنی ئێسقانی ملی حەیوانەکە و، جیاکردنەوەی سەری لە لاشەی حەیوانی بێ زمان ئازار بدەی بەڵکوو چاک وایە لە پاش بڕینی قورقوراچکە و سوورێنچکە و وَدَجَيْنْ ئارام بگرێ هەتا حەیوانەکە گیانی دەرچێت ئەنجا مۆخی ببڕێ و بە کاری دیکەوە خەرێک بێت. (باقیات صالحات ج ٣ ص ٢٢١ مامۆستا ڕەبیعی)
ئەگەر حەیوانێک زامار بوو یان شمشێرێک کەوت بە سەریا یان ماڵ رووخا بە سەریا وە گیانی جێ گرتوو (حَيَاةٌ مُسْتَقِرَّةٌ)ی تیا بوو، کە نیشانەکەی ئەوەیە بینێ و بیسێ و جمو جووڵی ئیختیاری ببێ و خوێنی بازرقە بەستێ، وە زوو سەری بڕی، ئەوە ئەو حەیوانە حەڵاڵە، باوایش بزانێت ئەگەر سەری نەبڕێ لە پاش تاوێ مردار ئەبێتەوە، ئەگەر گیانی جێ گرتووی تیانەبوو، یان گیانی جێ گرتووی تیابوو بەڵام سەری نەبڕی ئەوە حەرامە. (إعانَةُ الطَّالِبِينْ ج ٢ ص ٣٤٧)
هەر لەو بارەی سەرەوە ئەگەر حەیوانێک ماڵ رووخا بە سەریا، یان کەوتە نێو چاڵێکەوە، وە نەیدەتوانی سەری ببڕێ، تەواوی لەشی ئەو حەیوانە شوێنی سەربڕینە، ئەتوانێ بە هۆی شتێکی تیژەوە وەکوو سیخ

یان شمشێر وە هەر شتێکی ئاوەها برینێکی کارکەر لەو حەیوانە بەدی بێنێ کە ببێتە هۆی گیان دەرچوونی بەو مەرجەی حەیوانەکە گیانی جێ گرتووی تیابێ. (باقیات صالحات ماموستا رەبیعی)

## (سوننەتەکانی حەیوان سەربڕین)

گرنگترین سوننەتەکانی حەیوان سەربڕین ئەوانەی خوارەوەن:

١ـ ئەو کەسەی حەیوانەکە سەر ئەبڕێ ڕوو بکاتە قیبلە.

٢ـ حەیوانەکە ڕوو بە قیبلە بە سەر لای چەپدا ڕاکێشرێ.

٣ـ پێی ڕاستی حەیوانەکە بەرەڵلا بکرێ.

٤ـ دەست (هەر دوو دەست) و پای چەپی حەیوانەکە ببەسترێ.

٥ـ بڕینی ڕەگی ملی حەیوانەکە «وَدَجَيْن» وەکوو لە پێشا باسمان کرد سوننەتە بۆ ئەوەی حەیوانەکە زوو گیانی دەرچێت.

٦ـ هەروەها سوننەتە ئەو کەسە کە حەیوانەکە سەر ئەبڕێ چەقۆ یا کێردەکەی تیژ بکات و پیشانی حەیوانەکەی نەدات، لەم بارەوە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی: «إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ. فَإِذَا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا القِتْلَةَ وَ إِذَا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ. وَلْيُحِدَّ أَحَدُكُمْ شَفْرَتَهُ. فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ». موسلیم لە شەددادکوڕی ئەوسەوە گێراویانەتەوە، واتا: خوای ـ عَزَّ وَ جَلَّ ـ لە سەر کوللی شتێک ئیحسانی فەرزکردوە دەر حەقی بکرێ. کە ئینساتتان [بە وەجهی شەرعی] کوشت چاکی بکوژن، بە عەذاب مەیکوژن. کە حەیوانتان سەر بڕی جوانی سەربڕن ئەذیەتی مەدەن کێردەکەتان تیژ بکەن. ئەوی سەری ئەبڕن ڕەحەتی بکەن بە ئەذیەت سەری مەبڕن.

٧ـ هەروەها سوننەتە لە کاتی سەربڕینا (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بکا.

٨ـ ئەگەر وشتری سەربڕی لە خوار قوڕقوڕاچکەیەوە چەقۆی لێ بنێ. بۆ گاو مەڕو بزنیش لە سەر قوڕقوڕاچکەیان دابینێ. بەڵێ باش وایە کەمێک بە لای لاشەکەیانەوە بێ بۆ ئەوەکە باش سەر ببڕێن. خودا فەرموویەتی: «فَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ. سورەی حج / ٣٦»

واتا: کەواتە ناوی خودا بەرن لە سەریان لە کاتێکا ئامادە کراون بۆ سەربڕین بەم ڕەنگە وەستاون بە پێوەو، دەست و، قاچیان ڕیز کردوە، وە یا لە سەر سێ پەل وەستان و دەستی ڕاستیان بە سراوەتەوە ئەوە ش بە گوێرەی باوی سەربڕینی وشتر.

هەروەها بۆ مریشک و پەلەوەر سونەتە زمانیان دەرکێشێ و بیخاتە بەر دەنووکیان بۆ ئەوەی زمانیان نەگەڕێتەوە دواوە و قورقوراچکەیان دانە پەڕێ، کە ئەوەش ئەبێ بە هۆی مردار بوونەوەیان.

## فەلسەفە و سوود وقازانجی سەربڕینی شەرعی، وە ناوی خودا هێنان لە کاتی سەربڕیندا

تا ئەو شوێنەی کە بۆ ئێمە دەر ئەکەوێ سوود و قازانجی سەربڕینی شەرعی ئەمەیە: کە حەیوانەکە لە کورت ترین کاتدا گیانی دەر ئەچێت، وە بە بێ ئەزیەت و ئازار بە زووترین کات ئاسوودە ئەبێ، وە هەر لە بەر ئەمەیە ئەبێ ئامرازی سەربڕین تیژ بێ، هەتا زووتر کاری خۆی بکا، وە مەرجی دیکەی ئەوەیە ئەبێ سەر بڕینەکە لە سەر قورقوراچکە و سوورێنچکە و قوڕوی حەیوانەکەبێ، چونکە بڕینی ئەو شوێنانە ئەبنە هۆی دەرچوونی گیانی حەیوانەکە بە زووترین و سووکترینی شێوە.

وە سوود و قازانجی هێنانی ناوی خودا لە کاتی سەر بڕیندا ئەمەیە:

لە لایەکەوە ناوی خودا هێنان بەر بەرەکانێ و بەر هەڵستێکە لە گەڵ ئەو یاسا ناحەزانەی بوت پەرستەکان لە زەمانی نەفامیدا ئەیانکرد، کە ئەوەیش ئەوە بوو بەکاتی سەربڕیندا بە دەنگی بەرز ناوی بوتەکانیان ئەهێنا، کەوایە لە حالێکدا بوت پەرستەکان لە کاتی سەربڕیندا ناوی بوتە هیچ و پووچەکانیان بێنن، موسوڵمانان چ جۆر ناوی خودای گەورە نەهێنن.

لە لایەکی دیکەیشەوە باقی حەیوانەکان لەوەدا کە دروس کراوی خودان و، مەو جودێکی زیندوون و، حەقی ژیانیان هەیە و، لەم ڕوومەوەلە گەڵ ئینساندا هاوبەشن شەک و گومانێک نیە، کە وابوو ئینسان بە بێ ئیزنی

خودا وە فەرمانی ئەو ناتوانێ بە سەر ئەو گیانلەبەرانەدا زاڵ بێ، وە حەقی گیان کێشان و لە بەین بردنی ژیانی ئەوان بە خۆی بدات.

وە ئەمە تەنیا ویست و ئیرادەی خودایە کە تەواو ئەوانەی لە ڕووی زەوینا دروستی کردوە بە بۆنەی سوود و قازانجی ئینسانەوەیە، لە بەر ئەمە بردنی ناوی خودا لە کاتی سەربڕیندا هەر ئەو ئیزن وەرگردنەیە لە خودا کە ناوبرا.

وەکوو ئەمە وایە کە ئینسان بڵێت: من ئەم کارە لە خۆمەوە، وە بە هۆی دەس درێژی و زۆرو ستەم لەم حەیوانە، وە یا بە هۆی بێ دەسەڵاتی ئەو حەیوانە ئەم کارە ناکەم، وە ئەم حەیوانە سەر نابڕم، بەڵکوو بەناوی خودا و بە ئیزن و فەرمانی ئەو ئەم حەیوانە سەر ئەبڕم یا نەچیر ئەگرم، وە بە ناوی ئەو گۆشتی ئەم حەیوانە ئەخۆم. (الحلال و الحرام دکتر یوسف قرضاوی)

## (حەیوان سەربڕین لە قەساوخانەکانی ئیمڕۆژیدا)

بە کار بردنی ئەو شتانەی کە خۆ بە دەستەوەدانی حەیوانەکە لاواز دەکەن وەکوو دەرمانی بێ هەستکەر لە پێش سەربڕیندا بەو مەرجەی نەیئتە هۆی لە نێو چوونی حەیوانەکە دروستە.

بەڵام ئەگەر بە شتی قورس بدەن بە سەریدا و بێ هۆشی کەن، یان بە هۆی ئامرازی کارەبایی لە کاری خەن حەرامە، چونکە ئەبنە هۆی ئازار و جەزرەبەی حەیوانەکە، هەرچەن ئەگەر ئەو حەیوانە کە ناوبرا گیانی جێ گرتووی تیابێ و سەر ببڕێ گۆشتەکەی ئەخورێ.

وە حەیوان سەربڕین لە قەساوخانەکانی ئیمڕۆژیدا کە لە دوای بێ هست کردنی حەیوانەکە بە چەن سانیەیەک بە ئامرازی تیژ سەری ئەبڕن دروستە. (اَلفِقْهُ الاَسلامِیُ وَ اَدِلَّتُهُ دکتر زحیلی ج ٣ ص ٦٨٨)

(بزانن) خواردنی ئەو گۆشتانەی کە لە وڵاتانی ئەهلی کیتاب (گاور و جولەکە) ئەیهێنن حەڵاڵە با ناوی خودایشیان لە سەری نەهێنابێ بەومەرجەی بە جۆرێکی باش واتا: بە ڕەوشتی ئیسلامی یان ئەهلی کیتاب

سەر بڕابێ، نەک خنکاندبێتیان وە یان ملیان هەڵکندبێ.

بەڵام ئەو گۆشتانەی کە لە وڵاتانی کۆمۆونیستی و بوت پەرستی و بێ دینی و شیرکەوە ئەیهێنن وەکوو دەوڵەتانی: ژاپۆون و هیندو چین و ڕوسیە بە هیچ جۆرێک حەڵاڵ نیە لە بەر ئەوەی موشریک هاو بەش بۆ خودا قەرار ئەدەن و کۆموونیستەکانیش خودا و تەواوی دینەکان و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەران و زیندوو بوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ ڕەد ئەکەنەوە.

وە ئەو قوتابیانە کە لە وڵاتانی کۆموونیستی و بوت پەرستی و شیرکدا دەرس ئەخوێنن ئەبێ لە خواردنی گۆشتی سەربڕاوی ئەوان دووری بکەن وە زیاتر خەزای گیاهی و دانە وێڵەی ئەوان بخۆن، وە یان ئەو گۆشتانەی کە لە وڵاتانی ئەهلی کیتابەوە واردی ئەکەن بیخۆن، وە لە گۆشتی حەیواناتی حەرام وەکوو بەراز و غەیری ئەوانە خودداری بکەن. (الفقە الاسلامی ج ٣ ص ٦٨٩ و حلاڵ و حەرام قەرضاوی ترجمە ص ٩٣)

## بەشی سێهەم
## خواردەمەنی خاوێن و حەڵاڵ (اَطعِمَة)

(اَطعِمَة) کۆی (طَعَام)ە کە بە مانای خواردەمەنی‌یە، وە لەم بابەدا باس لەو حەیوان و باڵدارانەوە دەکات کە گۆشتیان حەڵاڵە وە یان گۆشتیان ناخورێ و حەرامە، وە هەروەها لە بارەی باقی خواردەمەنیەکانەوە باس دەکات، وە باسی خواردنەوەیش (اَشرِبَة) بەیان دەکرێ، کەوابوو لە پێشا لە بارەی ئەو شتە حەرامانە کە بە ڕۆشنی لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا بەیان کراوە باس دەکەین وە لە پاشاندا بە ڕیز باس ئەو حەیوان و باڵدارانە ئەکەین کە گۆشتیان ئەخورێ وە یان گۆشتیان ناخورێ بە پێی نووسینی کتێبە شەرعی‌یەکان.

خودا لە قورئاندا فەرموویەتی: «قُلْ لا اَجِدُ فِي ما اُوحِيَ اِلَيَّ مُحَرَّماً عَلىٰ طاعِمٍ يَطْعَمُهُ اِلاّ اَنْ يَكُونَ مَيْتَةً اَوْ دَماً مَسْفُوحاً اَوْلَحْمَ خِنْزِيرٍ فَاِنَّهُ رِجْسٌ اَوْ فِسْقاً اُهِلَّ لِغَيْرِاللهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ باغٍ وَ لا عادٍ فَاِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَحِيمٌ» سورەی ئەنعام / ١٤٥

واتا: جا تۆ ـ ئەی پێغەمبەر ـ بۆ دەفعی شوبهەی خەڵک ئیعلان بکە و بڵێ: من لەو کەلامی خودادا کە بە وەحی ئەگات بە من نابینم حەرام لە سەر تەعام خۆرێ مەگەر ئەو مردارەوە بووبێ یا خود خوێنێکی ڕژاو بێ یا گۆشتی بەراز؛ چونکی بە ڕاستی ئەوە پیسە، یا حەیوانێکی سەربڕاوی خاریج لە یاسای ئیسلام بێ بەم ڕەنگە لە کاتی سەربڕینیا ناوی غەیری خودای لە سەر برابێ، جا هەر کەس ناچار بێ بۆ خواردنی ئەم جۆرە شتانە ئەگەر تەجاوە زنەکا بە سەر بەشی کە ساوەکوو دوو ناچار بەکێکیان بەشی خۆی و ڕەفیقەکەی بخوات و لا نەدا لە ئەندازەی خۆیشی بە زۆر خواردن ئەوە بزانن خودای تەعالا بەرابەر بەو کەسە تاوان پۆش و مێهرەبانە. ئەم یاسا کە باسمان کرد بۆ ئوممەتی ئیسلامە.

لەم ئایەتەدا بە کورتی بە چوار شتی حەرام ئاماژەی کردوە:

١ـ مردارەوە بوو. (مَيْتَةٌ)
٢ـ خوێنی ڕژاو (مَسْفُوحٌ)
٣ـ گۆشتی بەراز (خِنْزِيرٌ)
٤ـ ئەو حەیوانەی لە کاتی سەربڕینیدا ناوی غەیری خودای لە سەر برابێ.

وە لە سوورەی مائدە / ٣ خودای تەعالا ئەم شتە حەرامانە (مُحَرَّمَاتٌ)ەی بە دوور و درێژی (درێژە پێدان و ڕوون کردنەوە) بەیان کردوە، وە فەرموویەتی: «حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَ الدَّمُ وَ لَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَ مَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَ الْمُنْخَنِقَةُ وَ الْمَوْقُوذَةُ وَ الْمُتَرَدِّيَةُ وَ النَّطِيحَةُ وَ مَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَ مَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ».

واتا: حەرام کراوە لە سەر ئێوە ـ ئەی موسوڵمانەکان،
یەکەم: خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، واتە ئەو گیانلەبەرە کە بەبێ سەربڕینی شەرعی مردبێ.
دووەم: خواردنی خوێنێ کە ڕەوان بووبێ.
سێهەم: گۆشتی بەراز.
چوارەم: گۆشتی ئەو حەیوانە کە لە کاتی سەربڕینیا دەنگ بەرز کرابێتەوە بە ناو بردنی غەیری خودای تەعالا.
پێنجەم: خواردنی گۆشتی حەیوانی خنکاو بە هەر جۆرێ بێ: بە پەت، یا بە ئاو، یا لە ژێر خانووی ڕووخاوا، یا یەکێ دەستی نابێتە بینی...
شەشەم: خواردنی گۆشتی حەیوانێ لێدرابێ بە دار یا بە بەرد هەتا مردبێ.
حەوتەم: گۆشتی حەیوانێ لە بەرزی کەوتبێتە خوارە وە مردبێ، یا خود کەوتبێتە ناو بیریکەوە و مردبێ.
هەشتەم: گۆشتی حەیوانێ کە قۆچی لێدرابێ و بە زۆری قۆچ مردبێ.
نۆهەم: گۆشتی حەیوانێ کە دڕندە لێی خواردبێ هەتا گیانی دەرچووبێ، مەگەر ئەوانەیان کە زوو فریایان بکەون و لە پێش ئەوەدا گیانیان دەربچێ سەریان ببڕن، واتە ژیانی ڕاستە قینەیان تیا مابێ لەو کاتەدا کە سەریان ئەبڕن، وە ئەمەیش ئەزانرێ بە جموو جووڵی بەهێزوە بەوە کە خوێنیان لە

وەختی سەربڕینیانا پەلەمیزکە بەستێ.
دەهەم: گۆشتی حەیوانێ لە سەر بتەکانا سەر براێ. وە یا ئەو حەیوانانەکە سەریان ببڕێ لە سەر ئەو بەردانەدا کە دانراون لە دەوری بەیتاوە بە هیوای ئیحسان حەیوانیان لە سەر ئەکوژرێتەوە. وە حەرامکراوە لە سەرتان ئەمە کە رزق و ڕۆزی خۆتان بە (ئەزلام) وەرگرن وە ئەم فیسقە، وە رزق وەرگرتن بە (ئەزلام)ە بە چەن جۆر کراوە.
(بڕوانە کۆتایی ئایەتەکە لە سورەی مائدە تەفسیری نامی مامۆستا مدرس)
(بزانن) حەیوانێک کە بۆ قەدر گرتن و بەڕێز گیری (تَعْظیمْ) لە بەر پای کەسێکدا سەر ئەبڕرێت حەرام و مردارەوە بووە: «وَ مَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللهِ بِهِ». وە حەرامە ئەوەی بۆ غەیری خودا و ڕێز گرتنی غەیری ئەو سەر براێ. (ق.ص.ر. ص ۲۲۵ ج ۳)
(ئاگاداری) حەیوان سەربڕین لە بەر پای کەسێکدا، نەک بە نیشانەی ڕێزگیری (تَعْظیمْ) وە نزیکی (تَقَرُّبْ) لەو کەسە، بەڵکوو بە نیشانەی دڵ خۆشی وە بە هیوای بەخشین لە شوکرانەی هاتنی کەسێک بۆ ئەو جێگە، یا هاتنەوەی لە سەفەر، یا سەر کەوتنی ئەو، یا نەجات بوونی لە گێرە و کێشە، ئیشکالی نیە، هەروەها حەیوان سەربڕین لە پێش ماشیندا (کە تازە سەندبێتیان) یا بۆ تەواوکردنی خانووی نوێ، یا لە دایک بوونی منداڵ یا بۆ حەوتەم ئیشکالی نیە (چونکە سەربڕین لەم حاڵانەدا لە بۆ غەیری خودا نەبووە)
سەربڕینی قوربانی وە هەروەها سەربڕینی حەیوانێک کە بۆ شوکرانەی ساڵهات وە لە دایک بوونی پێغەمبەری نازدار (د.خ) بە ئەنجام دێ، هەروەکوو باقی سەربڕاوەکان ئەبێ تەنها بە ناوی خوداوە بێت.
کە وابوو ئەگەر حەیوان سەربڕ لە کاتی سەربڕینی قوربانیدا بڵێت «بە ناوی حەزرەتی ئیبراهیم یا حەزرەتی ئیسماعیل یا بەناوی هەردووکیانە» یا بڵێت «بە ناوی خودا وە بە ناوی ئیبراهیم و ئیسماعیل یا یەکێک لەوان» یا لە

کاتی سەربڕینی مەولوودیدا بڵێت «بە ناوی پێغەمبەر» یا بڵێت «بە ناوی خودا وە بە ناوی پێغەمبەر» ئەوە حەیوانە سەربڕاوەکە حەرامە وە مردارەوە بووە.

بەڵام ئەگەر بڵێت لە کاتی سەربڕینی قوربانیدا «بە ناوی خودا وە بە یادی قوربانی ئیبراهیم و ئیسماعیل» یا لە کاتی سەربڕینی مەولوودیدا بڵێت «بە ناوی خودا وە بە یادی بیرەوەری لە دایک بوونی پێغەمبەر» یا بۆ شوکرانەی لەدایک بوونی پێغەمبەر تێشکالی نیە. (باقیات صالحات ج ٢ ص٢٢٦)

(بیداری) سەربڕین بۆ شوێنە پیرۆزەکان وەکوو: کەعبەتوڵڵا، مزگەوتی (أقصیٰ) مزگەوتی پێغەمبەر لە مەدینە، گۆڕی پێغەمبەران، ئەولیاء، زاناکان، شەهیدان، پیاو چاکان، یا بۆ ئەشخاص: ئینسان، فریشتە، پەری، نارەوایە، وە ئەو حەیوانە سەربڕاوە حەرام وە مردارەوە بووە، چونکە سەربڕین بە عیبادەت حیسابە وە عیبادەت بۆ غەیری خودا کوفر و بێ دینیە. بە کورتی ئەو قوربانیانەی بۆ قەبر و زیارەتگاکان سەر ئەبڕێن حوکمی قوربانی کردنی هەیە بۆ (ئەزلام) وە بە رابەری ئایەتی ٣ سوورەی مائدە بە مردارەوەبوو حیساب ئەکرێ. باقیات صالحات ج ٢ ص ٢٥٤ و إعانةُ الطّالبینَ ج ٢ ص ٣٤٦)

(ئیسلام تەواو ئەو شتانەی کە خاوێن و بێ زەرەرن حەڵاڵ کردوە)

خودا لە قورئاندا فەرموویەتی: «یا أَیُّهَا النّاسُ کُلُوا مِمّا فِی الأَرْضِ حَلالاً طَیِّباً ولا تَتَّبِعُوا خُطُواتِ الشَّیطانِ إِنَّهُ لَکُمْ عَدُوٌّ مُبِینٌ» «بقرە / ١٦٨» واتا: ئەی ئادەمیزاد بخۆن لەو خواردەمەنیانە کەدەستان پێ ئەگا لە ئەرزا بە مەرجی ئەمە کە حەڵاڵ و ڕەوابێ خواردنی، واتە ماڵی خەڵک نەبێ، وە (طَیِّبْ) بێ، واتە بە تەبیعەتی ئینسانی سەلیم قیزەون نەبێ. وە مەکەونە دووری هەنگاوەکانی شەیطان: حەرام لە بۆ خۆتان حەڵاڵ مەکەن، وە حەڵاڵ لە سەر خۆتان حەرام مەکەن، بە ڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی دیاریە.

## گیانداران لە بارەی شوێنی دانیشتن و ژیان بە سەربردن بە سە تاقم دابەش دەکرێن

١ـ هەر حەیوانێ لە ئاوا بژیی وەکو ماسی، گۆشتی حەلاڵە و سەربڕینی ناوێ، خوا لە سەر صورەتی ماسی بێ یانە و زیندووبێ یا مردووبە هەر بەو شەرتە کە بۆگەنی نەکردبێ. ئەمە قەوڵ و ڕێڕەوی جەمهوری زاناکانە جگە لە ئیمام ئەبوو حەنیفە، وە بەڵگەیشیان ئەم ئایەتەیە کە خودا لە قورئاندا فەرموویەتی: «أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَ طَعَامُهُ مَتَاعاً لَكُمْ وَ لِلسَّيَّارَةِ سورەی مائدە / ٩٦» واتا: حەلاڵ کراوەبۆ ئێوە، ئەی موسوڵمانان، نەچیری دەریا و خواردەمەنی دەریا لەوی کەوتبێتە سەر ئاو یا خود ڕۆچووبێ لە بەر لەزەت وەرگرتنتان لەو نەچیر و خواردەمەنی دەریایە بۆ ئێوە کە نیشتە جێ بن وە بۆ کاروانیان خواه لە ئیحرامدا بن یا لە ئیحرامدانەبن.

وە ئیمامی ئەبوو حەنیفە فەرمویەتی تەواوی گیاندارانی ئاوی جگە لە ماسی حەرامن. (الفقه الاسلامی و ادلته ج ٣ ص ٦٧٨)

وە هەندێک وتوویانە ئەگەر وێنەی ئەو گیاندارانە کە لە دەریادا ئەژین لە وشکیدا حەلاڵ بوو، وە گۆشتی خورا ئەوە گۆشتی ئەوانیش ئەخورێ و حەلاڵە، بەلام ئەگەر وێنەیان لە وشکیدانە ئەخورا لە دەریاشدا ناخورێ بینا لە سەر ئەم فەرموودە، گای دەریایی وە مەڕ و بزنی دەریایی گۆشتیان ئەخورێ بەلام سەگ و کەری دەریایی گۆشتیان ناخوری وە حەرامن. (مُغْنِیْ المُحْتَاج ج ٤ ص ٢٩٨)

٢ـ هەر حەیوانێ لە ئاو و وشکیدا (بۆمائی) بژیی وەکوو: قورباقە، قرژاڵ، ڕەقە (کیسەڵی ئاوی)، مار، مارماری شۆک (تِمْساح)، وە سەگی ئاوی سە قەول هەیە:

الف ـ پەیڕەوانی ڕێبازی حەنەفی و شافیعی فەرموویانە: خواردنیان حەلاڵ نیە چونکە ئەوانە کە ناوبران لە (خَبَائِث) ناپاک و چەپەڵەکانن، وە مار ژاریشی هەیە، وە قورباقە نەهی کراوە لە کوشتنی (ئەگەر حەلاڵ بوایەت نەهی نە ئەکرا لە کوشتنی)

ب - پەیڕەوانی ڕێبازی ئیمامی مالیک فەرمویانە: خواردنی قورباقە و قرژاڵ و ڕەقە (کیسەڵی ئاوی) مەباحە (یانی خواردنیان ئیشکالی نیە) چونکە نە ئایەت و نە فەرموودەی پێغەمبەر حەرام بوونی ئەوانەیان بەیان نەکردوە، وە بەر (خَبَائِثْ) ناکەون.

ج - پەیڕەواتی ڕێبازی حەنبەلی جیایان کردوە تەوە، وە فەرموویانە: تەواو ئەوانەی کە لە وشکیدا ئەژین لە حەیواناتی ئاوی بە بێ سەربڕین حەلاڵ نین وەکو پەلەوەری ئاوی وە ڕەقە وە سەگی ئاوی، مەگەر ئەوانەی کە خوێنیان نیە وەکو قرژاڵ.

وە قورباقە مەباح نیە و گۆشتی ناخورێ چونکە پێغەمبەر نەهی کردوە لە کوشتنی و ئەمەیش بەڵگەیە لە سەر حەرام بوونی گۆشتی قورباقە، هەروەها گۆشتی مارماری شۆک (تِمْسَاحْ) حەرامە و ناخورێ (الفقه الاسلامی ج ٣ ص ٦٨٧)

## ٣ـ گیاندارنی وشکی

گیاندارانی حەلاڵ گۆشتی وشکی کە بە ئاشکرایی ناویان براوە بەم جۆرەی خوارەوەن: چوار جۆرە گیاندارەکان «وَ الأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَ مَنَافِعُ وَ مِنْهَا تَأْكُلُونَ.» «نَحْل / ٥» واتا: وە خودای تەعالا وشتر و گاو مەڕو بزنی دروست کردوە بە تەوانایی خۆی، وە هەیە بۆ ئێوە لە سوودی ئەوا بەرگێ کە ئەبێ بە هۆی گەرمی لەشتان لە کاتی ساردی هەوادا، وە گەلێ سوودیتر وەکو شیر و دۆو ڕۆن و پەنیر و کەشک... وە سوار بوونیان و بار پێبردنیان، وە لە نەفسی خۆیان ئەخۆن، واتە سەریان ئەبڕن و گۆشتەکەیان ئەخۆن.

### (حەرام بوونی کەر و هێستر)

«وَ الْخَيْلَ وَ الْبِغَالَ وَ الْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَ زِينَةً وَ يَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ» «نَحْل/٨»

واتا: وە خودای تەعالا دروستی کردوە بۆ ئێوە ئەسپ و ماین و هێستر و

کەر بۆ ئەوە کە سواریان پێ بکەن و بیان کەن بە هۆی جوانی بۆ خۆتان، وە هەروا دروست ئەکا بۆ ئێوە ئەوەی کە ئێوە نایزانن وە بە کار ئەبرێن بۆ سواری و زینەت و جوانی؛ وەکو فرۆکەی ئاسمانی و ساروخ، وە ئوتومبیل لە عەرزی وشکاندا، وەکەشتی و قەیاغ و... لە دەریادا، وە غەیری ئەمانە لە وشتانەکە خودای تەعالا پاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە تەوفیقی ئادەمیزادی داوە بۆ دروستکردنی ئەوانە و بە کار هێنانیان (نامی)

## (حەرام بوونی گۆشتی دڕندە و باڵندەی ڕاوی)

ئیبنو عەبباس (خا) گوتی: «نَهىَ النَّبِيُّ (ص) عَنْ كُلِّ ذي نابٍ مِنَ السِّباعِ وَ عَنْ كُلِّ ذي مِخْلَبٍ مِنَ الطُّيُورِ» واتا: هەر دڕندەیێ کەکەڵبەی هەبێ، یا هەر باڵندەیێ کە چنگ و چرنووکی[1] هەبێ پێغەمبەر (د.خ) خواردنی گۆشتەکەیی قەدەغە کردووە. وەک: شێر و بەور و پڵەنگ و بەراز و گورگ و سەگ و چەقەڵ و پشیلە و ورچ و مەیموون و کەرکەدەنگ. «جَلاَّلَه» گۆشت و شیر و هێلکەی جَلاَّلَهْ (حەیوانێک کە پیسی دەخوات) مەکروهە «نَهىَ رَسُولُ اللهِ عَنْ لَحْمِ الجَلاَّلَةِ» پێغەمبەر خواردنی گۆشتی جَلاَّلەی قەدەغە کردووە. مەگەر ئەوەی چل ڕۆژ لە خواردنی پیسی بیپارێزن و تەنیا ئاڵفی پاک بخوات (مختار الصّحاح)

## (ئەوانەی وا فەرمان دراوە بە کوشتنی)

ئەوانە وا فەرمان دراوە بە کوشتنی وەک دووپشک و مار و قەلەباچکە (قشقەڕە) و کۆلارە و مشک بە هەموو صنفێکیانەوە حەرامن و گۆشتیان

---

۱ـ هەر باڵدارێ کە چنگی تیژ و نینۆکی فولایی و دەنووکی لار (خوار)ی بێ و ڕاوی پەلەوەر بکا وەک باز و شاهین و هەڵۆ... حەرامن (شەریعەتی ئیسلام بەرگی یەک ص ۲۹۴)

ناخورێ، هەروەها ئەوانەی وا کوشتنیان قەدەغە کراوە وەک قورباقە و هەنگ و مێرووله و پەپوو سلێمانکه و شەمشەمە کوێرە حەرامن.

هەر گیان لە بەرێ کە بە قسەی دو کتێری باوەڕپێکراو زەهری ببێ، ئەوانەش حەرامن و گۆشتیان ناخورێ.

## (حەیوان و باڵداری حەلاڵ)

حەیوان و باڵداری حەلاڵ ئەوانەن کە لە قورئان و حەدیسا وترابێ گۆشتیان حەلاڵە، یا عالمانی دین بە قیاس لە سەر حەیوان و باڵداری حەلاڵ وتبێتیان حەلاڵە وە گۆشتی ئەخورێ وەک:

١ـوشتر ٢ـگا ٣ـبزن ٤ـمەڕ چ ماڵی و چ کێوی ٥ـکەمتیار ٦ـکەرەکێوی ٧ـ ئاسک ٨ـکەروێشک ٩ـڕێوی ١٠ـدەڵەک ١١ـ چالەکە ١٢ـ سمۆرە ١٣ـ ژیژک ١٤ـکەڵەشێر ١٥ـ مریشک ١٦ـ بۆقلەموون ١٧ـ قاز ١٨ـ قولەنگ ١٩ـ سۆنە ٢٠ـ مراوی ٢١ـ پۆڕ ٢٢ـکەو ٢٣ـ مێشەسی ٢٤ـ ماسیگرە.

وە هەرچی چینە بکا وەک: ٢٥ـ کۆتر ٢٦ـ قومری ٢٧ـ بیبی‌سوو بە هەموو جۆرە کانیەوە. ٢٨ـ چۆلەکە بەهەموو تەرحێکیەوە ٢٩ـ سووچەڕ ٣٠ـ قەلەڕەشەی ناو کشت و کاڵ ٣١ـ ڕیشۆلە ٣٢ـ حەینە مەل، ئەمانە هەموو حەلاڵن.

هەر حەیوان و باڵدارێک کە لە ئایەت و حەدیسا ناوی نەهاتبێ و زانایانی دینیش باسیان نەکردبێ، حوکمی وەک ئەو حەیوان و باڵدارە وایە کە لە وێنەی خۆی بێ و ناوی هاتبێ یا باسی کرابێ. ئەگەر وێنەشی نەبوو ئەوە ئەگەر کەسانی طەبیعەت بەرزو دەس ڕۆیشتوو بە باشیان ئەزانی، حەلاڵە، ئەگینا حەرامە، هەر حەیوانێک و هەر باڵدارێک کە پەیدا ببێ لەدوو جۆر یەکێکیان گۆشتی بخورێ و ئەویان گۆشتی نەخورێ، ئەویش هەر حەرامە. مردارەوە بوو حەرامە. کوللەو ماسی نەبێ.

«عَنْ ابنِ عُمَرَ (رض) عَنِ النَّبِيِّ (ص) قَالَ: أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَانِ وَ دَمَانِ. فَأَمَّا

الْمَيْتَانِ فَالْحُوتُ وَ الْجَرَادُ وَ أَمَّا الدَّمَانِ فَالْكَبِدُ وَ الطِّحَالُ»(١)

واتا: ئیبنو عومەر (خا) گوتی: پێغەمبەر (د) دەفەرموێ: دوو مردار و دوو خوێنمان بۆ حەڵاڵ کراون. مردارەکان برێتین لەماسی و لە کوللە، وە خوێنەکانیش برێتین لە جەرگ و سپڵ.

هەروەها هەر پارچەیەک کە لە حەیوانێکی زیندووی حەڵاڵ جیا کرابێتەوە حەرامە، (شەریعەتی ئیسلام ماموّستا مدرس ج ١ ص ٢٩٥)

(بزانن) لەپەلەوەرە نەناسیاوەکاندا هەر کامیان دانەخۆر یا خاڵ لەمل بن یا وێنەی پەلەوەرە حەڵاڵ گۆشتەکان بن: یا لە کاتی باڵگرتنەوەدا باڵیان تەکان بدەن وەکو کەسێک کە دەف لێ بدات حەڵاڵن «كُلْ مَا دَفَّ وَدَعْ مَا صَفَّ» واتا: گۆشتی پەلەوەرێک کە باڵ لێدەدات بخۆ، وە گۆشتی ئەو پەلەوەرەی کە باڵ باز دەکات و باڵ لێنادات مەخۆ.

هەروەها هەر باڵندەو پەلەوەرێک کە بەبێ هەناسە کێشان، وە قوم قوم (جرعە جرعە) ئاو ئەخواتە وە نەک دەم بنێ بە ئاوەکەوە وە هەڵی مژێ و ملقی لێ بات ئەوە گۆشتی حەڵاڵە، یا دەنگی وەکو دەنگی کۆتر گەڕانەوەی بێ (كُلُّ مَا عَبَّ وَ هَدَرَ) یانی هەموو پەلەوەرێک کە قوم لەدوای قوم ئاو ئەخواتەوە بەبێ هەڵمژین. وە دەنگی بگێڕێتەوە حەڵاڵە (باقیات صالحات و مُغْنِيُ الْمُحْتَاج ج ٤ ص ٣٠٢)

(ئاگاداری) ئەگەر حەیوانێک شیری حەیوانێکی حەرام گۆشتی خوارد وەکو ئەوە بەرخێک شیری سەگێک بخوات ئەوە گۆشتەکەی مەکروهە وە بە فەرموودەی ئیمامی غەززالی (رح) ئەهلی پارێزکاری و دوورینی ئەو گۆشتە ناخۆن وە ئەبێ لەو شیرە بیگرنەوە وە تاچل رۆژ ئالفی پاک و خاوێن بخوات ئەنجا گوشتەکەی خاوێن ئەبێتەوە (مُغْنِيُ الْمُحْتَاج ج ٤ ص ٣٠٥)

(بزانن) خودای تەعالا هەموو شتێکی بۆ بەندەکانی خەلق کردووە تا بە شێوەیەکی ڕەواو دروست سوودی تەواوی لێ وەرگرن، لەم بارەوە

١ـ تاج‌الحديث ج ٣ ص ٩٣

## ناوی گیاندارەکان بە تەرتیبی پیتەکان

باب الف ١- (ئاسک)

ئاسک بە کوردی جەیران و مامزیشی پێ دەڵێن، بە فارسی «آهو» و بە عەرەبی پێ دەڵێن (ظبی)[1]، گیاندارێکە کاوێژ دەکا، دەست و قاچی باریک و درێژن، چاوی ڕەش و جوانە، خێرا ڕاکردنی بەناو بانگە، گۆشتی ئاسک و خۆشە

بە زۆری لە گەرمیان و دەشت و نەرمانا ئەژین، پێست و تووکیان زەردەو مەیلەو سپی یە، شاخیان قنجەو باریک بە پێنج مانگ ئەزێن، ڕاوچیەکان بە داو بە تەپکە بە تفەنگ بە تانجی ڕاویان دەکەن، لەریزی حەیوانی وردە و دووسمدا ناو ئەبرێن، میسک و عەبیری ناوکی ئەم گیاندارە مەشهورە

(حُکْم) ئەم گیاندارە بە هەموو جۆرێکیانەوە گۆشتیان ئەخورێ.

## ٢- (ئایلەمَنْ)

ئایلەمَن یا ئاینەمەل، وە عایلەمەن هەم دەڵێن بە فارسی پێ دەڵێن «سارە»، وە «مرغ ملخ خوارە» وە بە عەرەبی پێ دەڵێن (مَرْمَرْ) ڕیشۆڵەی سوور باڵندەیەکە چکۆڵە، گەورەتر لە چۆلەکە لە ئاخری وەرزی بەهاردا پەیدا ئەبێت، ئازاری تری و توو و، کوللەیە.

(حکم) گۆشتی ئەخورێ و حەلاڵە وە لەریزی چۆلەکەو ڕیشۆڵەیە (صید)

## ٣- (ئەسپ)

ئەسپ وڵاخی بەرزە لە هەموو گیاندارەکانی ئەم وڵاتە بەرزترن بەکوردی چارەوێیشی پێ دەڵێن، بەنێرەکانیان ئەڵێن ئەسپ و بە

---

١- و غزال

مێچکەکانیان ئەوتریٰ ماین بە فارسی پیٰ ئەوتریٰ (اسب) وە بەعەرەبی (فَرَسْ)ی پیٰ دەڵێن. گیاندارێکی چوارپیٰ، بەرزی، یەکسمی، کلک و یاڵ درێژی، شۆخ و شەنگی ژیرە.لە زۆر کۆنەوە کەری کراوە، بۆ سواری و بارهەڵگرتن و غارە ئەسپ، ٢٥ تا ٣٠ ساڵ دەژی.

(حُکم) چارەویٰ بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی (رض) حەلاڵە وەگۆشتی ئەخوریٰ بەلاٌم بە مەزهەبی ئەبوو حەنیفە و مالک و ئەوزاعی خواردنی مەکرووهە.

هەندێک لەزاناکان وتوویانە بە دەلیلی ئەم ئایەتەی خوارەوە گۆشتی ئەم گیانلەبەرە بۆ خواردن نابیٰ، خودا فەرموویەتی: «وَ اَلْخَيْلَ وَ الْبِغَالَ وَ الْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَ زِينَةً» سورە نحل آیەی ٨

واتا: خودای تەعالا دروستی کردوە بۆ ئێوە ئەسپ و ماین و هێسترو کەر بۆ ئەوە کە سواریان پیٰ بکەن و بیانکەن بە هۆی جوانی بۆ خۆتان. وتوویانە ئەم ئایەتە مینەت دائەنی لەسەر مرۆڤ بەمەکە ئەمانەی دروست کردوە و خواردنی گۆشتی حەیوان بالاٌترین قازانجە کە وایە ئەگەر گۆشتی ئەسپ و ماین بخورایەت خودای تەعالا باسی ئەوەیشی ئەکرد، وەخودای حەکیم مینەت دانان بەشتی گەورە تەرک ناکات و شتی پایین بەیان کات.

ولاٌمەکەی ئەمەیە ئایەتەکە ئەفضەلیەت بەیان دەکات وە غالب لە چارەویٰدا جوانی و سوار بوونەتی لەبەر ئەوە خودا ئەوەی بەیان کردووە وە هەروەها ئایەتەکە لە مەککەدا نازل بووە وە گۆشتی ولاٌخی ئەهلی لە ساڵی حەوتی کۆچی لەخەزای خەیبەردا حەرام کراوە کە وایە پێغەمبەر و یارەکانی بەم ئایەتە ئەسپ و ولاخ و غەیری ئەمانەیان حەرام نەکردوە، تا لەخەزای خەیبەردا پێغەمبەر گۆشتی کەری ئەهلی حەرام کرد، وە دەلیلی دیکە بۆ حەلاٌڵ بوونی گۆشتی چارەویٰ ئەوەیە حەدیس «صَحِيحَيْن» کە ئەسماء ڕیوایەتی کردوە وە فەرموویەتی «ئێمە لە مەدینەدا لە زەمانی پێغەمبەردا ئەسپێکمان سەربڕی وە گۆشتەکەمان خوارد».(مغنی المحتاج ج ٤ ص ٢٩٨)

## ٤- (ئێستر)

ئێستریان هێستر کە بە فارسی پێ ئەوترێ قاطر و استر، وە بە عەرەبی پێی ئەڵێن (بَغْلْ)، گیانداریکی یەک سمە، ئەم گیاندارە دایکی مایینە و باوکی گوێ درێژە، واتە هەرکاتێ نێرەکان حەزیان لە هێستر کرد ئەچن ئەو دوو رەگەزە پەیدا ئەکەن لەیەکتری چاکیان ئەکەن ئێستر بە ئەندازەی دایکی بەرز نیەو، وەکوو باوکیشی بچوک نیە، بەڵام لە هەردووکیان بەهێزترە، ئەم جۆرە چوار پێیە نەزۆکن.

(حُکم) ئێستر حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکە لە دوو گیاندار لەدایک بووە کە یەکێکیان حەرام گۆشتە کەوایە لایەنی حەیوانە حەرام گۆشتە کە زاڵە بەسەر ئەوی دیکەدا بەڵام ئەگەر لەبەینی کەری وەحشی و چارەوێدا لەدایک ببوایەت گۆشتی ئەخورا. جابیر ئەڵێت: لەرۆژی خەزای (حُنَیْن)دا ـ ئێستر وکەرو مایینمان سەربڕی پێغەمبەر (ص) قەدەغەی گۆشتی ئێستر و گوێ درێژی لێمان کرد بەڵام ئیجازەمانی دا لەگۆشتی ئەسپ بخوێن. (حَیاةُ الحَیَوانْ ـ دمیری)

باب باء

## ٥- [باز]

باز، یان تەرڵان کە بە فارسی و عەرەبیش هەر «بازی» پێ دەڵێن جۆرە باڵندەیەکی دڕندەیە، گۆشتخۆرو وریا و خێرایە، نیزیکەی سی چل سانتیمتر درێژ دەبێ، باڵی کورت و باریکە، دەندووکی خوارە و بەرسینگی پەڵە پەڵەی رەشی تێدایە، ئەم باڵندەیە دەتوانێ مەلانی تر بە عاسمانەوە راو کا، بۆیە پاتشا و گەورە پیاوانی قەدیمی وەکوو یەکێک لە کەرەستەی نێچیروانی بە خێویان دەکرد و لەبارەگا و دیوەخانە کانیان کار بەدەستی تایبەتی بۆ نیگاداری و خەزمەتی تەرخان دەکرا. باز (باڵندەی راوی)

(حُکمْ) باز بەهەموو جۆرێکیانەوە حەرامن وە گۆشتیان ناخورێ لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ص) نەهی کردوە لە خواردنی گۆشتی باڵندەی چنگدار و راوی و دڕندە.

## ٦- [بایەقوش]

بایەقوش، یان کوندە بەبوورکە بە فارسی «بوم» وە بە عەرەبی (جُغْد)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکە وەحشی، ڕوومەتی پانە، چاوەکانی گەورەن، دەندووکی لارە، (خوارە) لەم لاو ئەولای سەریدا دوو پەڕ وەکوو گوێی پشیلە هەیە، زیاتر لەچۆل و وێرانەدا ئەژی، شەوانە لە هێلانەکەی دێتە دەرەوە مشکی کێوی و باڵندەی چکۆلە ڕاو دەکات و دەبخوات بە نەحس و بەدیومن بەناو بانگە

(حُکم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ. (حیاةالحیوان دمیری)

(ئامۆژگاری) لە حەزرەت (سُلَیْمان) درود و سەلامی خودای لێ بێ نەقڵ کراوە کە فەرموویەتی: هیچ باڵندەیەک بۆ مروڤ لەکوندە بەبوو چاکتر و بەرەحم‌تر نیە، کاتێک لە وێرانەیەکدا ئەخوێنێ دەڵێ: کوانێ ئەو کەسانە کە لەدونیادا خۆشیان ئەگوزەراندو دارای ماڵ و سەروەت بوون، و هەر بۆ ماڵی دونیا هەوڵیان بوو؟ هاوار بۆ مرۆڤ چلۆن خەریان لێ ئەکەوێ لە حاڵێکدا تەنگانەی زۆر لە پێشیانە؟ توشەی دوا ڕۆژ هەڵگرن ئەی کەسانێ کە ئاناگان وە خۆتان بۆ سەفەری دوا ڕۆژ ئامادە کەن. (إعانَةُ الطّالِبِين ج ٢ ص ٣٩٩)

## ٧- [باشوو]

باشوو، یان واشە، بە فارسی پێی دەڵێن«باشە» و بە عەرەبی (وَاشِقْ - بَاشِقْ). باڵندەیەکی ڕاوکەری بچکۆلەیە کە درێژایی دەوری سیی سانتیمتر دەبێ، چاوی زەردن، پشتی کەوە ڕەنگ و بەرزگی سپییە پەڵە پەڵەی زەردی تاریکی تێدایە، لە حەوا باڵندەی‌تر دەگرێ و جارو بارەش هێلکەی پەلەوەران دەخوا.

(حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکە ئەمیش وەکوو باز ڕاو دەکات و باڵندەیەکی چنگدارە و پێغەمبەر نەهی کردوە لەگۆشتی ئەوانە.

## ٨- [بزن]

بزن بە فارسی پێی دەڵێن «بز» وە بەعەرەبی (مَعْز، و ماعِز)ی پێ ئەوترێ، گیاندارێکی گیاخۆری کاوێژ کەرە، دوو شاخی هەیە بەرەو دواوە دەشکێنەوە، ڕدێنێکی درێژ و کلکێکی کورتی هەیە، لە زۆر کۆنەوە کەوی «ماڵی» کراوە، شیر دەدا و لەشی (موو) دایپۆشیوە.

(حُکمْ) گۆشتی بزن حەلاڵە بە نەصی ئایەت، خودا لە قورئاندا فەرموویەتی: «أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهِيمَةُ الأَنْعَامِ» «مائدە / ١»

واتا: حەلاڵ کراوە بۆ ئێوە خواردنی گۆشتی ئەو حەیوانانە، وشتر و، گاو، مەڕ، بزن، ماڵی بن یان کێوی نێربن یان مێچکە، بە هەموو جۆرێکیانەوە حەلاڵن.

## ٩- [بۆقلەموون]

بۆقلەموون، یان قەل وە ئەلیشیش، بە فارسیش پێی ئەوترێ «بوقلمون» یان «پیل مرغ» وە بە عەرەبیش هەر پێی ئەوترێ (بُوقَلَمُونْ) مەلێکی ماڵییە بەقەد قازێک ئەبێ، نێرەیان خۆی کیت ئەکاو سەر دەنووکی پارچە گۆشتێکی پیاشۆڕ ئەبێتەوە. (حُکمْ) گۆشتی ئەخورێ

## ١٠- [بولبول]

بولبول بە فارسی پێی دەڵێن «هزار-وبلبل» وە بە عەرەبی پێی دەڵێن (عَنْدَلِيبْ) باڵندەیەکی دەنگ خۆشی بازمڵەیە، بە قەد چۆلەکەیەک ئەبێ: لە وەرزەکانی بەهارو تاوساندا زیاتر لەسەر دار و گوڵەکاندا ئەبێ: وە ئەوینی ئەو بو گوڵ بەناو بانگە

(حُکمْ) حەلاڵ گوشتە و گۆشتی ئەخورێ. دمیری ج ٢ ص ١٥٥ مغنی المحتاج ج ٤ ص ٣٠٢

## ١١- [بەراز]

بەراز بەفارسی «خوک» وە «گرازە»ی پێ دەڵێن وە بە عەرەبی پێی دەڵێن

(خِنْزِیْ)، گیاندارێكی بەهێزو قورسە، بەچكەی خۆیان بەشیری مەمكان بەخێو دەكەن، سمی هەیە، پێستی ئەستوورە، تووكی كورت و ڕەقە، لمبۆزی هەیە، دو ددانی لەولاو لەملای دەمی هاتوونەتە دەر (شفرە)یان پێ دەڵێن، بۆ خۆ پاراستن و شەركردن كەڵكیان لێ وەر دەگرێ بەراز زیاتر لەناو زۆنگ و مێشەو دارستاندا دەژی و شەوانە دەر دەكەوێ و زەویی دەكێڵێ و زیان بەباغ و كشتوكاڵ دەگەیێنێ.

بەراز گیاندارێكی قەڵەوە و گۆشت و خەزو بەزێكی زۆری هەیە، دەست و قاچی لەچاو گەورەیی جەستەی كورتن، ملی ئەوندە نیە كە بتوانێ سەری بەم لاولای خۆیدا وەرچەرخێنێ، بەرازی نێر یا گۆلە بەراز (برەك) و (یەكانە)ی پێدەڵێن و دێڵەكەشی (مالۆس)ی ناوە. مالۆس هەر عومری گەیشتە نۆ مانگ توانایی ئەوەی دەبێ یەكانە هەڵبگرێ و ساڵێ دووجار، لەسەرەتای بەهار و پاییزدا دەترەكێ و هەرجارە ٦ـ١٢ بەچكەی دەبێ كە پێی دەڵێن (كۆدەڵە) یا (بزەڵە) بەراز تا پازدە ساڵان دەژی. (حُكمْ) گۆشتی بەراز حەرامە و پیسە بە دەلیلی ئایەی ٣ سورەی مائدە كە لە پێشدا نووسیمانە و ئایەی ١٤٥ سورەی أنعام كە ئەفەرمێت: «أَوْ لَحْمَ خِنْزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ» واتا: یا گۆشتی بەراز؛ چونكی بەراستی ئەوە پیسە. بەڕاستی زەوق و تەبیعەتی سالم لە خواردنی گۆشتی بەراز دوری ئەكات و بە پیسی ئەزانێ چونكە خۆشترین خواردەمەنی بەراز پیسی و كەسافەتە، وە (طبِّ جدید) سابتی كردوە كە خواردنی گۆشتی بەراز زیانئاوەرە وە ئەبێتە هۆی دروستبوونی كرمی كوشندە و خەتەرناك[1]، وە ئەبێتە هۆی بێ‌غیرەتی پیاو لە بەرانبەر ژنەكەیدا یانی تەبێعەتی بەرازی ئەبێ، لەبارەی ناموسەوە غیرەتی (پیاوەتی) كەم ئەكاتەوە (تفسیر المنیر جزء ٦ ئایەی ٣ مائدە)

١ـ بەڵێ خواردنی گۆشتی بەراز كرمی (شریتی) یاتی (دودة الوحیدە) و تەراخینە لەگەدەیا دروست ئەكات

## ١٢- [بەران]

بەران بەفارسی پێی دەڵێن قوچ وە بە عەرەبی (كَبْش)، شەكە نێرێکە تەمەنی لە چوار ساڵان تێپەڕبێ و شاخ و سەرو سەکوتی جوان و ڕێک و پێک بێ، بە تایبەتی بەخێوی دەکەن و دەیرەنگێنن و لەکاتی پێویستدا بەری دەدەنە ناو مەران بۆ ئەوەی ئاوسیان کا.

(حُكْمْ) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ لەباسی بزندا ژمارەی ٨ نووسیمان بەران و مەڕو وشتر و گاو مانگاو بزن (بَهِيمةُ الأَنْعَامْ) بە حوکمی قورئان حەڵاڵن.

## ١٣- [بەور]

بەور، یا بەبر بە فارسی و عەرەبیش هەر (نَمِر)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی گەورەی گۆشتخۆری دڕندەیە، لە جەنگەڵەکانی ئاسیاو ئەمریکا و ئەفریقا هەیە، پشت ولاتەنیشتەکان و قاچ و قولی ڕەنگێکی نارنجی زۆر جوانە، بەرزگ و ژێر مل و دەم و چاریشی سپییە و هەموو لەش دێغ دێغی ڕەشی تێدایە. دووصەت کیلۆ قورس دەبێ و ٢٥ ساڵێک دەژی. بەشەو ناخەوێ و لە لێرەکان خۆی مات دەکاو بە تایبەت پەلاماری ئادەمیزاد دەدات هەر بۆیە لەزمانی هیندیدا ناوێکی لێ نراوە کە بەکوردی دەیتە (پیاوخۆر). بەوری بەیان.

(حُكْم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکە دڕندەیە و کەڵبەی زۆر تیژی هەیە.

## ١٤- [بزن مژە]

بزن مژە، بە فارسی پێی دەڵێن بز مجەوە چلپاسە بە عەرەبی (وَرَلْ). جۆرێکە لە مارمێلکە، لەشی لاکێشەیی‌یە مل و کەلەکەی باریکە کلکی بێ تێستقانە، گیانداری بچووک ئەخوات، لەناو چەگەرمەکان ئەژی (القاموس العلمي المصوّر)

(حُكم) گۆشتی ناخورێ و حەرامە بینا لەسەر قەولی زۆر لە زاناکان (دمیری ج ٢ ص ٣٩٦)

## ١٥- [بۆرچین]

بۆرچین، یا ئوردەک، بەفارسی (اُزدک) و بە عەرەبی (بَطّ) جورێکە لە مراوی ڕەنگێکی بۆری هەیە باڵ ئەگرێتەوە (هەڵ ئەفڕێ) (حُكمْ) گۆشتی حەڵاڵە و ئەخورێ چونکە ئەم مەلانە لە (طَيِّبات)ن و پاک و خاوێنن، وە تەواوی باڵندەی ئاوی حەڵاڵن جگە لە حاجی لەقلەق (مغني المحتاج ج ٤ ص ٣٠٢)

## ١٦- [بەرخ]

بەرخ بەفارسی «بَرّه» و بە عەرەبی (حَمَلْ - سَخْلَة)ی پێ ئەوترێ بەچکەی نێرو مێی (مەڕ) پێش ئەوەی بۆ بڕینەوە دەست بدا. (حُكمْ) گۆشتی حەڵاڵ و ناسکە.

## ١٧- [بزنە کێوی]

بزنە کێوی یا فیلە گێجە، بە فارسی «بُزکوهی» و بە عەرەبی (وَعْل)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی گیا خۆرە، وەکوو ئاسک دەچێ، نووکی شاخەکانی خوارە، لە جێگای سەخت دەژی و بە (ڕەوەز) و (زەرد) و ماهان هەڵدەگەڕێ، ڕەنگی زەردێکی کاڵە، تیسکی (موو)ی زۆر کورتە بەر پەنجە ناکەوێ لە چیاکانی کوردستان زۆرە و نێچیرەوان بۆ خاتری گۆشتی ڕاوی دەکەن

(حُكم) بە ئیجماعی زاناکان گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە وە هەروەها لە (أَنْعام)ە (حياة الحيوان دميري ج ٢ ص ٤٠٤)

باب «پ»

## ١٨- [پەپوو سلێمانکە]

پەپوو سلێمانکە، بە فارسی «شانه بسر» و بە عەرەبی (هُدْهُدْ)ی پێ ئەڵێن، باڵندەیەکی جوانە کلاوێکی بە سەرەوەیە لە باوەشێن ئەچێت. بە قەد کۆترێک ئەبێ، چیرۆکی پەپوسلێمانکە لە گەڵ حەزرەت (سُلَیْمان)دا بە ناوبانگە، کە خەبەری مەلیکەی سەبای بۆ هێنا (سورەی نَمْل ئایات ٢٠ بە دواوە) هەروەها دەعوەتی پەپوو، لە حەزرەت سُلیمان و لە شکرەکەی مەشهورە کە کوللەیەکی مردووی هێنا و خستیە ناو دەریاوە، وە وتی: فەرموون بخۆن هەر کەسێک گۆشتی دەست نەکەوێت قەید ناکات ئاو گۆشت زۆرە بەش هەمووتان ئەکات، حەزرەت سُلیمان و لە شکرەکەی پێ کەنینیان بەم میهمانیە هات، وە لەم بارەوە وتوویانە:

جَاءَتْ سُلَیْمَانَ یَوْمَ الْعَرْضِ هُدْهُدَةٌ ... أَهْدَتْ إِلَیْهِ جَرَاداً كَانَ فِي فِیهَا
وَ أَنْشَدَتْ بِلِسَانِ الْحَالِ قَائِلَةً ... إِنَّ الْهَدَایَا عَلَیٰ مِقْدَارِ مُهْدِیهَا
لَوْ كَانَ یُهْدیٰ إِلَی الْإِنْسَانِ قِیمَتُهُ ... لَكَانَ یُهْدیٰ لَكَ الدُّنْیا بِمَا فِیهَا

واتا: لە ڕۆژی ناوبراودا پەپووسلێمانکەیەک هاتە خزمەت حەزرەتی سُلیمان وە کوللەیەک کە بە دەندووک ڕاوی کردبوو وە هێنا بووی پێشکەشی کرد بە حەزرەت سُلیمان و بە زمانی حاڵ وتی: بە ڕاستی پێشکەشی بە ئەندازەی شانی ئەو کەسەیە کە ئەیهێنێ، چونکە ئەگەر قەرار وابێ ئەو شتە کە بە ئینسان پێشکەش ئەکرێ بە ئەندازەی شانی ئەو کەسە بێ کە پێی پێشکەش کراوە، ئەبێ تەواو دونیا و ئەوانەی لەم دونیا هەیە بە تۆ (سُلَیمان) پێشکەش کرێ. (حُکم) بە قەوڵی ڕاست و باوەڕ پێ کراو گۆشتی حەرامە چونکە گۆشتەکەی بۆگەنە (دمیری).

## ١٩- [پاساری]

پاساری، یا چۆلەکەوە مەلوچک بە فارسی «گنجشک» و بە عەرەبی

(عُصْفُور)ی پێ ئەڵێن. باڵندەیەکی چکۆڵەیە زیاتر لە ناو پاسارا هێلانە ئەکا،
(حُکم) گۆشتی حەڵاڵە

۲۰- [پشیلە] = کوتکە
پشیلە بە فارسی «گربه» و بە عەرەبی (هِرّ - قِطّة)ی پێ دەڵێن. دەعبایەکە لە وێنەی پڵنگ بەڵام گەلی پچووکترە، وە مێملی مشکە،
(حُکم) گۆشتی پشیلە حەرامە و ناخورێ بەڵام پاک و خاوێنە چونکە پێغەمبەر (ص) فەرموویەتی پشیلە پیس نیە و بە دەورتانا هەڵ ئەسوورێ و خاوێنە.

۲۱- [پڵنگ]
پڵنگ ، یا پڵێنگ بە فارسی «پلنگ» و بە عەرەبی (نَمِر)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی گەورەی بە چنگی بەلەکی چالاکی کوشندەیە کلکێکی باریکی درێژی هەیە، گۆشت خۆرە، پێستەکەی سپی‌یە و خاڵی ڕەشی تیایە، لە کێوەکانی ئاسیا و ئافریقادا ئەژین. لە شێر ئەچێ بەڵام ئەم چکۆلەترە، وە لە شێر ترسناکتر و ڕق ئەستوورترە تا ئەو جێگەی زۆر ڕقی هەستێ خۆی ئەکوژێ.
(حُکم) گۆشتی ناخورێ و حەرامە چونکی درندەیە و زەرەر و زیانی زۆرە تائەو جێگەی پێغەمبەر (ص) نەهی کردوە لەوەی کە لە سەر پێستەکەی دانیشن (دمیری ج ۲ ص ٣٦٤)

۲۲- [پەررە سێلکە]
پەررە سێلکە، یا تەرنە بابیلە بە فارسی «پرستو» و بە عەرەبی (خُطّاف - أبابیل)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی باڵ و سەر ڕەشی ژێر سک سپی بەر چەنەسووری کلک دووفاقی پچکۆلەیە.
زیاتر لە بانی خانوو بەرە (سەقف) هێلانە دروست ئەکا، مێش و مێشوولە

ئەخوات زیاتر لە حەوادا شکار دەکا لە کاتی سەرمادا ئەچێت بۆ گەرمەسیر و لە هەوەڵی بەهاردا دێتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.
(حُکم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ لە بەر ئەوەی پێغەمبەر (ص) نەهی کردوە لە کوشتنی تەرنەبایلە بە ڕیوایەتی عبدالرّحمن کوڕی مُعاویە.
(دمیری ج ١ ص ٢٩٤)

## ٢٣- [پێشە خۆرە]

پێشە خۆرە بە فارسی «استخوان خوار» و بە عەرەبی (رَخَمَة - أَنُوق)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی سپی‌یە، زیاتر لە چۆڵ و وێرانەدا ئەژی، جەستەی گەورەیە، تەنیا بە تێرەی خۆی ڕێ ئەدا و تەنیا یەک هێلکە ئەکا، لە ناو هەرەباندا باوە دەڵێن «لە هێلکەی ئەنوق نایابترە» وە هەروەها دەڵێن پێشە خۆرە، کەڕ، ولاڵە،
(حُکم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکە پێغەمبەر (ص) نەهی کردوە لە خواردنی گۆشتی پێشە خۆرە، وە هەروەها گۆشتی مردارەوە بور ئەخوات و پیس خۆرە.
(بێداری) ئەوەی کە مەعنای [رَخَمَه]مان بە پێشە خۆرە لێ داوەتەوە بە پێی بۆچوونی مەردووخەلە فەرهەنگەکەیدا بەلام (کمال جلال غریب) لە کتێوی (القاموس العلمی المصوّر)دا [رَخَمَه]ی بە لاشەخۆر مەعنا کردوەتەوە و، [نَسْر]ی بە پێشە خۆر مەعنا لێ داوەتەوە، (عمید) هەردوویانی بە لاشە خۆر مەعنا لێ داوەتەوە.

باب تاء

## ٢٤- [تانجی]

تانجی بە فارسی «تازی» و بە عەرەبی (سَلُوقِ) پێ دەڵێن، ئەمانیش لە ڕەسەنی سەگن بەلام توکن نین وەکوو سەگ بەڵکو درێژ و ڕاکێشراوترە لە سەگ، لاق و دەستیان و ملیان لە سەگ درێژترە، لمۆز و لووتیان باریکە،

(حکم) مەعلوومە لە رەسەنی سەگە و درِندەیە و سەگی شکاری‌یە، وە سەگیش پیس و حەرامە.

## ٢٥- [تاووس]

**تاووس**، بە فارسی و عەرەبی (طاؤوش)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی رەنگاو رەنگی ئێجگار جوانە کلکی وەک چەتر لێ ئەکا، کەوەرزی هاوین بێ پەرەکانی ئەوەرێ و دووبارە ئەروێتەوە، زیاتر لە هیندوستان و مالزی ئەژی، دەست رۆیشتوەکان بۆ جوانی و زینەت رای دەگرن، نزیکی سیی سال تەمەن ئەکا، خەڵکی بە بەدیومنی ئەزانن و دەڵێن تاووس بوە هۆی دەرکردنی ئادەم و حەووا لە بەهەشت.

(حکم) گۆشتی حەرامە چونکە گۆشتەکەی زۆر پیس و ناخۆشە و ئینسان دڵی ناچێتە سەری بازێ وتوویانە گۆشتی ئەخورێ لە بەر ئەوەی پیسی ناخوات، گۆشتی بخورێ یا نەخورێ کڕین و فرۆشتنی دروستە بۆ خواردن بێ یا بۆ جوانی (حیاة الحیوان دمیری جلد ٢ ص ٩٠ ـ مغنی المحتاج جلد ٤ ص ٣٠١ ـ اعانە ج ٢ ص ٣٩٨)

## ٢٦- [تووتی]

تووتی بە فارسی «طوطی» و بە عەرەبی (ببغاء ـ وە مەشهوورە بە «درّة»)، بە قەدکۆترێک ئەبێ، پەرەکانی سەوز و سوورن، دەندووکی لارە [خوارە] لە ناوچەی گەرمیان و هیندوستاندا زۆرە، ئەتوانێ بازێ و وشەفێر بێ و دووپاتی کاتەوە،

(حکم) بە قەولی باوەڕ پێ کراو گۆشتەکەی حەرامە لە بەر ئەوەی گۆشتەکەی، ناخۆشە و دڵ ئەیکە رهێنێ، بازێ و توویانە حەلاڵە چونکە شتی پاک ئەخوات و سەممی نیە و چنگی قولابدار نیە و ئەمر و نەهی نەکراوە بە کوشتن یا نەکوشتنی.

### ٢٧ـ [تەیهو]

تەیهو بە فارسی «تیهو» و بە عەرەبی (طَیهُوج)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی جوانە، لە کەو ئەچێت بەڵام لە کەو بچووکترە، وە گۆشتەکەی خۆش مەززەیە رەنگەکەی خۆڵە مێشی‌یەکی تێکەڵ بە زەردە، لە ژێر سکیدا خاڵی رەش هەیە،
(حُکم) گۆشتی حەڵاڵە (دمیری ج ٢ ص ١٠٢)

## باب جیم

### ٢٨ـ [جوررە]

جوررە بە فارسی «چکاوکە» وە بە عەرەبی (قُبَّرَة)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی بۆرە، کەمێک لە چۆلەکە گەورەترە، دەنگێکی خۆشی هەیە،
(حُکم) گۆشتی حەڵاڵە بە ئیجماعی زاناکان (دمیری ج ٢ ص ٢٤٠)

### ٢٩ـ [جوانوو]

جوانوو بە فارسی «کرە اسب» وە بە عەرەبی (فُرَیش) وە (فَصیلْ) وە (طِرْفْ)ی پێ دەڵێن (حکم) لە ژمارەی ٣ (ئەسپ) باسی لێ کراوە کە بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی گۆشتی ئەخورێ.

### ٣٠ـ [جووجە]

جووجە بە فارسی «جوجە» وە بە عەرەبی (فَرْخ)ی پێ دەڵێن، جووجکێکە کە کزر بووبێ ویەشتا نەبووبێ بە باررۆکە، جوو جوو (حکم) حەڵاڵە.

### مربوط بە ش ٢٨ [جوررە قازڵاخ]

جوررە قازڵاخی بە فارسی «قازلاق» و بە عەرەبی (قُنبَرَة)ی پێ دەڵێن، جۆرێکە لە جوررە، بڕوانە (جوررە) یەک حوکمیان هەیە.

## باب چیم

### ٣١ـ [چالەکە]

چالەکە بە پێی نووسینی مامۆستا مەردووخ بە فارسی پێی دەڵێن «رودَك» وە «زَبزَب» کە قامووسی حەسەن عەمیدیش بۆ (رودَک) وتوویەتی گیاندارێکی دڕندەیە کە لە پڵنگ ئەچێت، وە بۆ (زَبزَب) نووسیویەتی گیاندارێکی گۆشتخۆرە لە پشیلە ئەچێت، کە ئەمانە چالەکەنین، کە وایە وادەر ئەکەوێ فارس بە چالەکە (رودَک) وە (زَبزَب) ناڵێن. بەڵکوو وەکوو مامۆستا هەژار لە «هەنبانە بۆرینە»دا نووسیویەتی بە فارسی پێی دەڵێن «گورکَن» کە حەسەن عەمیدیش ئاوەها مانای «گورکَن»ی لێ داوەتەوە «ناوی گیاندارێکە لە (ورچ) ئەچێت، بەڵام چکۆلەترە لە ورچ، لە کون و کەلەبەری ژێر زەوی‌دا داڵان بۆ خۆی ئەکەنێ، وە لە ڕۆژدا لەوێ خۆی حەشارئەدا و شەوانە بۆ ڕاو دەرئەکەوێت» بەڵێ ئەمە چالەکەیە، کە بە عەرەبیش پێی دەڵێن (غُرَیْر) وە (غُرَیْر) وە (غُرغُون) گیاندارێکی شیر دەری قەڵەوە لە نێوان سەگ و پشیلە دایە پەلەکانی کورتە، لە کون و کەلەبەری ژێر زەوی‌دا ئەژی پێستەکەی بەنرخە. (القاموس العلمي المصوّر)

(حکم) گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە، ئەڵێن گۆشتەکەی بۆ «روماتیسم» چاکە.

(بێداری) مامۆستا مەلاکەریم (مدرّس) «وَبر»ی بە چالەکە مانا لێ داوەتەوە کە تەماشای ووشەی «وَبر»م کرد لە کتێبی (حیاة الحیوان دمیری)دا ئەو تاریفە ئەو لەوە بڕیەوە دەکات ئینسان دەڵێت چالەکەیە بەڵام زۆربەی نووسەران وتوویانە (غُرَیْر) چالەکەیە، کە ئێمەیش هەر پێمان وایە، وە باسی (وَبر)یش لە ژێر ووشەی «گورکن»دا ئەخوێنیتەوە، لە جلدی دووەم لاپەڕەی ٤٠٩ ی (حیاة الحیوان)دا لە ژێر ووشەی (غُرَیْر)دا نووسیویەتی «هەروەهایەعر گیاندارێکی قەڵەوە لە خوراساندا ئەژی و بازێ وتوویانە ئەمە بەم مانا (غُرَیْر)، نەک (غُرَیْر)، بەمە میسال دێننەوە دەڵێن «لە چالەکە قەڵەوترە»

## ٣٢ـ [چەرخ]

چەرخ، یا شاباز بە فارسی «چرغ» وە بە عەرەبی (صَقْرٌ)ی پێ دەڵێن. باڵندەیەکی گۆشتخۆرە، لە جۆری بازەکانە، راودەکات، بە قەد قاڵاوێک ئەبێ رەنگێکی خۆڵەمێشی تێکەڵ بە نوقتەی رەش و سپی هەیە.
(حکم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ لە بەر ئەوەی چنگی تیژ و قولابدارە (دمیری)

## ٣٣ـ [چەقەڵ]

چەقەڵ بە فارسی «شغال»وە بە عەرەبی (إبْنُ آوي) پێ دەڵێن، بۆیە وای پێ دەڵێن چونکە هەرکاتێ لە رەفێقەکانی دوور کەوتەوە لە شەودا بە هۆی دەنگی هاو تورمەکانی کە قیرەیان لە قیرەی منداڵ ئەچێت ئەیاندۆزێتەوە، گیاندارێکی کێوییە لە سەگ ئەچێ چنگ و نینۆکی درێژە، راو دەکات، باڵندە و مریشک ئەگرێ و ئەیخوات بۆ گیانی مریشک لە رێوی خراوترە.
(حکم) بە قەولی راست و باوەڕ پێ کراو گۆشتی حەرامە لە بەر ئەوەی بە کەڵبەی راو دەکات و باڵندە و مریشک ئەگرێ و ئەیخوات، بازێ وتوویانە وەکوو رێوی کەڵبەی زەعیفە کەوایە گۆشتی ئەخورێ بەڵام بە قەولی (مُحَرَّرْ و مِنْهَاجْ) حەرامە. (دمیری)

باب حاء

## ٣٤ـ [حاجی لەقلەق]

حاجی لەقلەق، یا لەقلەق بە فارسی «لک لک» وە بە عەرەبی (لَقْلَقْ)ی پێ دەڵێن، مەلێکی گەورەی رەش و سپی دەنووک و قاچ وملی درێژە لە سەر دار و جێگای بڵەند دا هێلانە دروست ئەکا، راوی حەشەرات و مشک و خزندە دەکاوئە یا نخوات، ماریش ئەخوات،
(حکم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ (بزانن) هەموو باڵندە ئاوییەکان حەڵاڵن جگە لە لەقلەق، لە بەر ئەوەی پیس خۆرە و باڵ لێنادات، ئەمە

قەولی بەغەوی و عوبادی‌یە، بەڵام بە لای شیخ أبو محمّد و غزّالی یەوە حەڵاڵە. (حیاة الحیوان دمیری ج ٢ ص ٣١٩)

## ٣٥- [حەوت ڕەنگیلە]

حەوت ڕەنگیلە بە فارسی «هفت رنگ»ە وە «دارپوزە» وە بە عەرەبی (حَسُّون) وە (شُرشُوُرْ)ی پێ دەڵێن، جۆرێکە لە چۆلەکە، ڕەنگاوڕەنگە
(حکم) گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە.

باب خاء

## ٣٦- [خومەڕەژە] یا [کاسەڵکەشینە] وە [کەنەسمە]

خومە ڕەژە، یا پێ بە قنگە بە فارسی «سبزک»ە وە بە عەرەبی (خُضَارِيّ) وە (شِقِراق)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی سەوزە، بە قەد کۆترێک ئەبێ، لە ڕۆم و شام و خۆراساندا زۆرن، هەنگ ئەگرن و ئەیخۆن لە کون و کەلەبەردا هێلانە ئەکەن،
(حکم) ڕەویانی و بەغەوی و ڕافیعی فەرموویانە حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکە پیس خۆرە و عەرەب بە پیسیان داناوە، وە بازێ فەرموویانە حەڵاڵە بۆ وێنە خاوەنی (أنوار) بەرگی دووەم لە لاپەڕەی ٥٠٢ دا بە حەڵاڵ گۆشت ناوی هێناوە. هەروەها مامۆستا ڕەبیعی لە باقیات صالحات دا ج ٣ ص ١٨٦

## ٣٧- [خەم خۆرە]

خەم خۆرە، بە فارسی «بوتیمار»ە وە بە عەرەبی (بلشُون) وە (مَالِكُ الحَزِين)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکە لە قەراغ ئاودا ئەژی، ماسی ئەگرێ و دەیخوات، دەنووکی درێژە، هەروەها قاچ و ملی درێژە، کلکی کۆتایە، پەڕەکانی سپی و سەوز و ئاوی‌یە (جاحِظ) ئەڵێت ئەم باڵندە لە شتە سەرسوورهێنەرەکانی دونیایە، کاری ئەجیبە لە قەراغ ئاودا ئەنیشێتەوە زۆرکات لە تووونیەتیا ئەمرێ ئاو ناخواتەوە نەبادا ئاوەکە تەواو بێ، هەرکە ئاوەکە وشک بێت

بوێ خەم بار ئەبێت،
(حکم) حەڵاڵ گۆشتە (دمیری ج ٢ ص ٣٢٣)

باب دال

## ٣٨ـ [دار تەقێنە]

دار تەقێنە، یا دار کونکەرە بە فارسی «دارکوب» وە بە عەرەبی (صُرَدْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی دەنووک درێژی سەر سووری بەر سنگ زەردی سەر باڵ ڕەش و سپی یە بە قەد ڕیشۆلەیەک ئەبێ، وەکوو تووتی بە پەنجەکانی بە دارا سەر ئەکەوێ و جرو جانەوەر لە ژێر پێستی دارەکەدا بە دەنووک دەردێنی و دەیخوات، دەنووکی زۆر تیژە باڵندەی بچووک ئەخوات.
(حکم) حەرامە گۆشتی ناخورێ چونکە پێغەمبەر نەهی کردوە لە کوشتنی، وە نەهی لە کوشتنی بەڵگەیە لە سەر حەرام بوونی. (دمیری ج ٢ ص ٦١)

## ٣٩ـ [داڵ]

داڵ، یا لاشە خۆر بە فارسی «لاشخور» وە بە عەرەبی (غُدَّاف)ی پێ دەڵێن، مەلێکی گەورەی گۆشت خۆرە، ڕەنگی ڕەشە، دەنووک و لاقی خۆڵەمێشی یە، زیاتر لە کەژوو کێودا ئەژی، بە (غُدَّافِ کَبِیْر) وە (جَبَلِی) بە ناو بانگە
(حکم) گۆشتی حەرامە (إِغاثَةُ الطَّالِبِينْ ج ٢ ص ٤٠٠)

## ٤٠ـ [دەڵەک]

دەڵەک بە فارسی «دلە» وە بە عەرەبی (دَلَق)ی پێ دەڵێن گیاندارێکی گۆشتخۆرە بە قەد پشیلەیەک ئەبێ قاچەکانی کورت و کلکی درێژە، پێستی نەرم و بەنرخە بە ڕەنگی زەرد یا قاوەیی ژێر مل و سکی بە سپی ئەڕوانێ، مریشک و کۆتر ئەگرێ و خوێنیان ئەمژێ
(حُکم) حەڵاڵە

## [دەڵەک سپی]

دەڵەکی سپی بە فارسی هەر ەدلەە وە بە عەرەبی (قـاقُمْ)ی پێ دەڵێن گیاندارێکە لە دەڵەک ئەچێت، پێستەکەی لە بەفرا سپی یە و لە هاوینداقاوەیی یە، بە شەو ئەگەڕێت کەروێشک و مار و مێروو ئەخوات پێستەکەی بە نرخە

(حکم) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ (باقیات صالحات)

باب راء

## ٤١- [ڕاسۆ]

ڕاسۆ، یا مشکی خورما بە فارسی ەموش خرماە وە بە عەرەبی (اِبْنُ عِرْسْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکە گەورەتر لە مشکی ماڵی، ڕەنگێکی خوڵەمێشی تێکەڵ بە زەردی هەیە، لوتی باریک و کلکی درێژی هەیە، مار ئەخوات.

(حکم) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخوری (مغنی المحتاج ج ٤ ص ٢٩٩)

## ٤٢- [ڕزق]

رزق بە فارسی ەنوعی از موشە وە بە عەرەبی (خَاقِلْ) وە (فَأْرَة)ی پی دەڵێن، گیاندارێکی قرتێنەرە لە مشک ئەچێت گوێی پردەکات لە دەغل و دان و ئەیبات بۆ کونەکەی بۆ زستان (حکم) حەرامە گۆشتی ناخورێ لە کتێوی (حیاة الحیوان دمیری ج ٢ ص ٢٠٠) دا دەڵێت: هەموو جۆرە مشکێک حەرامە و گۆشتیان ناخورێ جگە لە (یربوع = مشک کرونشک)

## ٤٣- [ڕەقە]

ڕەقە، یا کیسەڵ ئاوی بە فارسی ەلاک پشت آبیە وە بە عەرەبی (سُلَحْفَاة)ی پێ دەڵێن، دەعبایەکی ئاوی ڕەقی کلکدارە وەک کیسەڵ وایە.

(حکم) حەرامە و گۆشتی ناخورێ (دمیری ج ٢ ص ٣١٦ اَلْلَّجا)

## ٤٤- [ڕیشۆڵە]

ڕیشۆڵە، یا سێروو یا گاوانی، بە فارسی «ساری» وە بە عەرەبی (زُرزُور) وە (شُحرُور)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکە پەڕەکەی ڕەش و بریقەدارە
(حکم) گۆشتی حەڵاڵە (مغنی المحتاج ج ٤ ص ٣٠٢)

## ٤٥- [ڕێوی]

ڕێوی بە فارسی «روباه» وە بە عەرەبی (ثَعلَب)ی پێ دەڵێن، فێڵی ڕێوی بە ناوبانگە، دەڵێن: خۆی ئەکاتە مردوو، هەناسە لە خۆی ئەبڕێ چوار چەقەڵی بەرەوژوور ئەکاتەوە، تا گیانداران وابزانن مردووە، کاتێک حەیوانی چکۆڵەتر نزیکی بکەونەوە پەلاماریان ئەدات و ئەیانخوات. بە ڕێوی یان ووت: بۆچی تۆ لە سەگ زیاتر ڕاڤەکەیت، ووتی: من بۆ خۆم ڕاڤەکەم بەڵام سەگ بۆ کەسێکی دیکە.
(حُکم) بە مەزهەبی ئیمامی شافیعی گۆشتی ئەخورێ چونکە کەڵبەی زەعیفە و عەرەب بە پاکیان زانیوە، بەڵام بە مەزهەبی دوو پێشەوای دیکە (أبو حنیفە و مالک) مەکرووهە، وە بە لای ئیمامی ئەحمەد و بازێ دیکە لە زاناکان گۆشتی حەرامە. (اِغاثةُ الطّالِبِینَ ج ٢ ص ٣٩٨)

باب زاء

## ٤٦- [زرّافە]

زەرافە، یا ووشتر بەڵەک بە فارسی «شترگاو» وە بە عەرەبیش پێ دەڵێن (زَرّافَة) گیاندارێکی شیردەر و کاوێژکەرە، بە قەد ووشترێک ئەبێ مل و قاچەکانی درێژن، بڵەندی دەستەکانی و ملی تا ٦ میتر ئەڕوات، پێستی نوکتەی ڕەش و قاوەیی گەورە و چکۆڵەی تیایە وەکوو پڵنگ، دوو شاخی کورتی هەیە وەکوو گا، لە گەرمەسێردا وە بە تایبەت لە چۆڵ و دەشتی ناوەندی ئافریقادا ئەژی لە گەڵای دارەکان ئەخوات بۆ پێست و گۆشتەکەی ڕاوی ئەکەن،

(حکم) دوو قەوڵی لە سەرە بە لای هەندێ لە زاناکانەوە حەرامە چونکە لە بەینی حەیوانی حەڵاڵ گۆشت و حەیوانی حەرام گۆشتدا لە دایک ئەبێ، وە بە لای هەندێ دیکە لە زانایان گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە وە لە دوو حەیوانی حەڵاڵ گۆشت (مَأكُولَيْن) لە دایک ئەبێ، ئەم قەوڵە ڕاست و چاکترە. (دميري ج ٢ ص ٦ مغني المحتاج ج ٤ ص ٣٠٢)

## ٤٧- [زررەکەو] :پۆڕ

زررەکەو، بە فارسی «یوزه» وە بە عەرەبی (دُرَّاج) وە (حَيْقُطَان)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکە لەکەو ئەچێت (حکم) حەڵاڵە (باقيات صالحات)

## ٤٨- [زەردیوەرە]

زەردیوەرە، بە فارسی (پرندەای زردسیەبال) وە بە عەرەبی (تُفَز)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی زەردی پچوکە،

(حکم) حەڵاڵە چونکە لە تورمەی چۆلەکەیە، و هەر باڵندەیەکیش لە چۆلەکە و ڕیشوڵە بچێ حەڵاڵە.

## ٤٩- [زیقاوڵە] ماسی گرە

زیقاوڵە، ماسی گرەیشی پێ دەڵێن بە فارسی «ماهیخوارە» و بە عەرەبی (زُمَّجُ الْمَاءْ) وە (نَوْرَسْ)ی پێ ئەوترێ، باڵندەیەکی سپی یە لە کۆتر گەورەترە، ئەرواتە حەوادا لە پاشاندا خۆی بەر ئەداتەوە و خۆی ئەکاتە ناو ئاوەکەدا و ماسی ئەگرێت، جگە لە ماسی چتی دیکە ناخوات و ناچێتە سەر کەلاک.

(حُکم) گۆشتی ئەخورێ بەڵام (زُمَّجْ) کە باڵندەیەکی گەورەیە لە هەڵۆ ئەچێت فارسی پێ دەڵێن «دو بَرادَران» گۆشتی ناخورێ هەر وەکوو باقی حەیوانە ڕاویەکان (جَوَارِحْ) (فرهنگ مردوخ ج ١ ص ٩٦٦ و حياة الحيوان ج ٢ ص ٨)

باب ژ

٥٠ـ [ژووژوو]

ژووژوو، یا ژیژک بە فارسی «خارپشت» و بە عەرەبی (قُنْفُذْ) وە (شَوْهَبْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی خرینەی ئەندام درڕکاوی‌یە.
(حُکم) گۆشتی ئەخورێ، ئیمامی شافیعی خوای لێ رازی بێ ئەڵێت: حەڵاڵە چونکوو عەرەب بە پاکیان زانیوە، وە عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش هەر بەمە فەتوای داوە، بەڵام ئیمامی ئەبوو حەنیفە وە ئیمامی مالیک (رض) وتوویانە ژیژک حەڵاڵ نیە،
ئەڵێن لە خزمەتی پێغەمبەردا (ص) باسی ژیژک کرا، فەرمووی: (خَبِیْثَةٌ مِنَ الْخَبَائِثِ) پیسێکە لە پیسەکان، ئەم حەدیسە زەعیفە وە ڕاویەکانی نەناسراون.

باب سین

٥١ـ [سەقاقوش]

سەقاقوش، بە فارسی «سربفه» وە «سقالوش» و بە عەرەبی (بَجَعَةْ) وە (حَوَاصِلْ) وە (سَقَّاءْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی گەورەی درێژی قورگ ئەستوورە چیقڵدانەی ئاو زۆر هەڵ ئەگرێ، ئاوی وە ماسی گرە
(حُکم) حەڵاڵە (دمیری ج ١ ص ٢٧٣)

٥٢ـ [سەگاوی]

سەگ ئاوی بە فارسی «بیدستر» وە «سگ‌آب» و بە عەرەبی (قُنْدُسْ)ی پێ دەڵێن وە هەروەها (کَلْبُ الْمَاءْ)ی پێ ئەوترێ، گیاندارێکی ئاویی شیردەری قرتێنەرە کلکی پانە پێستەکەی بە نرخە.
(حُکم) لە لەیس کوڕی سەعد پرسیار کرا لە بارەی خواردنی گۆشتی سەگ ئاویی‌وە: فەرمووی خواردنی ئیشکالی نیە بازێ دیکەیش وتوویانە هەروەکوو ماسی گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە بەڵام هەندێ دیکە لە زانایان

فەرموویانە گۆشتی حەرامە چونکە وننەی لە وشکانیدا ناخورێ ئەم قەولە لە ڕاستی نزیکترە.

## ٥٣ـ [سەگ شکاری]

سەگی ڕاوی بە فارسی «یوزە یا سگە شکاری» و بە عەرەبی (فَهْدْ)ی پێ دەڵێن،
(حُکم) گۆشتی حەرامە چونکە کەڵبەی هەیە.

## ٥٤ـ [سەگ ماسی]

سەگ ماسی بە فارسی «سگە ماهی» و بە عەرەبی (قُقْنَةْ)ی پێ دەڵێن، گـوێرەکەی دەریا، گیاندارێکی شیردەری دەریایی‌یە لە مۆزەکەی لوولەیی‌یە کەڵبەی نیە
(حُکم) حوکمی سەگ ئاوی هەیە.

## ٥٥ـ [سەگ]

سەگ، بە فارسی «سگ» و بە عەرەبی «کَلْبْ»ی پێ دەڵێن.
(حکم) حەرامە چونکە دڕندەیەکی پیسە تا ئەو جێگەی پێستی سەگ و بەراز بە دەبباغیش پاک نابنەوە، وە ئەگەر شتێک پیس کەن ئەبێ ئەو شتە گڵ ئاو بکرێ (یانی حەوت کەڕەت ئاوی پاکەی کەڕەتی پێشووی گڵی تێکەڵاو بێ) وەکوو پێغەمبەر فەرموویەتی، بە زانیاری پزیشکی ئێستاش دەرکەوتووە کە وایە یانی چەشنە میکرۆبێ وا لە دەم و لووتیا بە قورراوی سوورنەبێ بە هیچ شتێ لە ناو ناچێ.

## ٥٦ـ [سەموور]

سەموور بە فارسی «سمۆر» و بە عەرەبی (سَمُّورْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکە لە دەڵەک و پشیلە ئەچێت پێستەکەی سووری مەیلە و ڕەشە و بە نرخە بە سەر

درەختیش دا سەر ئەکەونت.
(حُکم) حەڵاڵ گۆشتە وەکوو ڕێوی چونکە شتی پیس و چەپەڵ ناخوات.

٥٧ـ [سەمۆرە]

سەمۆرە، یا سِنجاو بە فارسی «سنجاب» و بە عەرەبی (سَنْجَاب) وە (قَرْقَلان)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە پشیلە پچکۆڵەترە، تووکی نەرم و پڕە بە ڕەنگی خۆڵە مێشی، کلکی درێژە زیاتر لە دارستان و بە سەر درەختەوە ئەژی، خۆراکی زستانی کە پستە و گوێز و شتە پێست ڕەقەکانە لە ژێر زەوی یان خاڵیەتی درەختدا قایم ئەکات، زۆرکات خۆی ئەگەیەنێتە هێلانەی باڵندەکان و هێلکەکەیان ئەخوات
(حُکم) گۆشتی حەڵاڵە بە قەولی باوەڕ پێکراو (دمیری ج ٢ ص ٢٤)

٥٨ـ [سووچەڕ]

سووچەڕ یان سیخوڕ بە فارسی «سیخول» و بە عەرەبی (دُلْدُل) وە (شَيْهَم)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی دڕکاوی‌یە بە قەد بۆقلەموونێک ئەبێ، کە ڕقی هەستا پەڕەکانی ئەهاوێژێ بەر هەر شتێک بکەوێ بریندار ئەکا.
(حُکم) گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە.

٥٩ـ [سۆنە]

سۆنە، یا مراوی بە هەموو جۆرێکیەوە کە بە فارسی پێ دەڵێن، «اُردَک» «بَتْ» وە «مرغابی» وە بە عەرەبی (حَذَقَة) وە (بَط)، سوورە مراوی وە سوورەقانگ (بَطْ أحْمَرْ) مراوی سەر سەوز (بَطْ بَرّي) شینە مراوی (بَطْ زَرْقَاوي) گیاندار و مرێکی ئاوی‌یە کە لە ئاودا مەلە ئەکات، دەنووکی پانە و لە نێوان ئەنگوستەکانیدا پەردە هەیە (یانی پای پەڕرە دارە) بە هۆی ئەوانە وە لە ئاودا مەلە ئەکات (حُکم) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ لە پێشا نووسرا کە مەلی ئاوی جگە لە لەقلەق هەمووی حەڵاڵن (مغنى المحتاج ج ٤ ص ٣٠٢)

## ٦٠- [سیسارکە کەچەڵە]

سیسارکە کەچەڵە، کەرگەز، داڵی کەرخۆر بە فارسی «کَرْکَس» و بە عەرەبی (نَسْر) وە (بُغَاثْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی گەورەیە، دەنووک و چنگێکی بە هێزی هەیە، ملی درێژە و بێ پەررە لاشەی مردارەوە بوو ئەخوات

(حُکم) گۆشتی حەرامە چونکە پیسە و مردارەوەبوو ئەخوات.

(دمیری ج ٢ ص ٢٥١)

(بزانن) لە کتێبی (اَلْقَامُوسُ الطِّبِيُّ الْمُصَوَّرُ)دا نَسْر و بُغَاثْ بە یەک باڵندە تێو دەبات بەڵام خاوەنی (حَيَاةُ الْحَيَوَانْ) و حەسەن عەمید لە فەرهەنگەکەیدا نَسْر بە داڵەکەرخۆر (کَرکَس) ناو دەبەن بەڵام بۆ (بُغَاثْ) نووسیویانە باڵندەیەکی ڕاوکەرە بە ڕەنگێکی تاریک چکۆڵەتر لە (کَرکَس) کە زۆر شەڕووڕە و بە زەحمەت باڵ ئەگرێتەوە وەلی مەعلووم و ڕوونە ئەمیش هەر حەرامە و گۆشتی ناخورێ. ئەمما ئەوەی کە لە (اَنوار جلد دوم ص ٥٠١ خطی)دا نووسراوە «وَيَحْرُمُ الْبُغَاثَةُ وَ هِيَ طَايِرٌ اَبْيَضُ بَطِيُّ الطَّيَرانِ يُقَالُ لَهُ عِنْدَنَا (ماهی گیره) واتا: هەروەها بُغَاثَة حەرامە کە مەلێکی سپی یە دێر باڵ ئەگرێتەوە وە لە لای ئێمە پێی دەڵێن: ماسی گرە» ئەمەسە هوە چونکە ماسی گرە گۆشتی ئەخورێ بەڵام بُغَاثْ گۆشتی ناخورێ.

## ٦١- [سوورەواڵە]

سوورەواڵە بە فارسی «سرخ داڵ» و بە عەرەبی (نَسْر اَحْمَرْ)ی پێ دەڵێن (فرهنگ مردوخ ج ٢ ص ٨٠)

(حُکم) گۆشتی ناخورێ.

## ٦٢- [سەمەندەر]

سەمەندەر بەفارسی «سَمَنْدَرْ» و بە عەرەبی (سُرْفُوتْ) و (عِظَايَهْ) و (سَمَنْدَرْ) و (سَمَنْدَلْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی مەشهورە لە مارمولەک ئەچێت، لەناوو وشکیدا ئەژی چوار پای هەیە، پێستی تاریک و لەکەی

زەردی هەیە، قەدی بە ٢٥ سانتیمیتر ئەگات لە زەوینی نمناک و تاریک‌دا ئەژی و جرو جانەوەرە ئەخوات، ئەڵێن لەئاگردا ناسووتێ، بەلای یۆنانیەکانەوە مەلێکی ئەفسانەیی‌یە کە چوەتە ناو ئاگرو هێلکەی کردووە، بازێ ئەڵێن باڵندەیەکە لەپەڕەکەی دەسرەیان دروست کردووە، کە چڵکن بووە خستوویانەتە نێو ئاگرەوە پاک و خاوێن بوەتەوە لەم بارەوە شێعرێکیان وتوە نازانم شێعری کێ‌یە لەخوا لێ‌خۆشبووی باوکمم بیستووە کە ئەڵێت:

**ای حریفان من سمندروارم آتش خوشم مثل ابراهیم وگلزار باشد آتشم**

(حُکمْ) حەرامە گۆشتی ناخورێ (فرهنگ عمید وە دمیری جلد دوّم)

## ٦٣ـ [سیموورغ]

سیموورغ بەفارسی (سیمرغ) و بە عەرەبی (عَنْقاء)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی ئەفسانەیی‌یە، ئەڵێن زۆر گەورە بووەو لەکێوی (قاف)دا هێلانەی بووە، لەچیرۆکی «شاهنامە»دا نێو مەلێ بووە کە (زاڵ)ی کوڕی (سام)ی لەکێوی (البُرز)دا هەڵگرت و بەخێوی کرد، وە لەپاش زەمانێ کە (سام) بەدوای کوڕەکەیدا چوو (سیمرغ) سامی بەزاڵ سپاردو پەڕێکی خۆی بەئەو دا تا هەر کاتێک پێویستی هاوکاری بوو پەڕەکەی ئەو بخاتە نێو ئاگرەوە، (سیموورغ) لەشەڕی (رستم) و (اسفندیار)دا بەتکای زاڵ چووە یاری ڕۆستەمەوە وە بە ڕاوێژی ئەو (اسفندیار) بەدەست ڕۆستەم کوژرا.

(حُکمْ) سیموورغ باڵندەیەکی ئەفسانەیی‌یە، کەس نەیدیوە ئەگەر دەستیش کەوێ ئەڵێن هێلکە ئەکات بەقەد کێوێک، کەوایە خۆی بەقەد دەکێو ئەبێ، دەی ئاخۆ کێ ئەتوانێ بیگرێت‌و بیخوات، ڕێویش بەو چلیسی و تامەزرۆیو فێڵەوە پێی ناوێرێ، تا بە ڕاوچی هەژار ئەگات.

(دمیری ج ٢ ص ١٦٢ وە فرهنگ عمیر)

## ٦٤ـ [شاهین]

شایین یا باڵەوان بە فارسی «شاهین» وە بە عەرەبیش هەر (شاهین)ی پێ

دەڵێن، باڵندەیەکی بۆری گۆشتخۆرە لە (باز) گەورەترە لە هەڵوو ئەچێت، دەندووکوو چنگۆڵی زۆر بەهێزن.
(حُكمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ لەبەر نەهی پێغەمبەر (ص) لەگۆشتی هەرگیاندارێکی خاوەن کەڵبەلە دڕندەکان، وە خاوەن چنگۆڵ لە مەلەکان.

## ٦٥ـ [شمقار]

شمقار بەفارسی «شنقار» و بە عەرەبی (شُنْقُر)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی گۆشتخۆری ڕاوکەری چوست و چالاکە.
(حُكمْ) گۆشتی ناخورێ چونکوو ڕاوکەرەو، چنگۆڵی تیژو بەهێزە.

## ٦٦ـ [شوان خەڵەتێنە]

شوان خەڵەتێنە بەفارسی «شبان فریب» و بە عەرەبی (مُكّاءْ)ی پێ دەڵێن، مەلێکە هەندێ لە چۆلەکە گەورەترە، تا ئینسان نزیکی نەبێتەوە هەڵنافڕێ.
(حُكمْ) حوکمی چۆلەکەی هەیە حەڵاڵە.

## ٦٧ـ [شەمشەمە کوێرە]

شەمشەمە کوێرە بەفارسی «شب پرە» وە بە عەرەبی (خُفّاش) وە (وَطْواطْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی پچووکە سکو زا ئەکاو قاچی بە باڵەکانیەوەیەتی لەمشک ئەچێت، ددانی زۆر تیژە و چاوەکانی زەعیفە بۆیە چاوی لەبەر خۆر هەڵنایە و هەر شەوانە دەرئەکەوێ و جرو جانەوەرە ئەخوات.
(حُكمْ) گۆشتی حەرامەو ناخورێ لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ص) نەهی کردوە لە کوشتنی.

## ٦٨ـ [شەلاقە]

شەلاقە بەفارسی «کژک» و بە تُرکی «چلیرچین» و بە عەرەبی (سَلْوىٰ) وە

(شمانی) پێ دەڵێن، باڵندەیەکی چکۆڵەیە بەقەد کۆترە باریکەیەک ئەبێ، لەبەهارا ناپەیدا ئەبێ، لەنێو کشت و کاڵ و گەنمدا هێلانە دروست ئەکات، گۆشتی چەورە.
(حُکمْ) بە ئیجماعی زانایان حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ٢)

### ٦٩ـ [شەوگەرد]

شەوگەرد بەفارسی «ریگ ماهی» و بە عەرەبی (اِسْقَنْقُور) وە (سَقَنْقُور)ی پێ دەڵێن، جۆرە مارمێلکەیەکی گەورەیە کلکی کورت و ئەستوورە قەدی بە ٢٥ سانتی‌میتر ئەگات لەئاوو وشکیدا ئەژی زیاتر لە قەراخی چۆمی (نیل)دا لەنێوان ریخ و ماسەدا پەیدا ئەبێ، هێلکە ئەکات و ئەیکاتە ژێر ریخەوە و هەڵیدێنێ.
(حُکمْ) بازێ ئەڵێن حەڵاڵە چونکە لە نەوعی ماسیە، وە یا لەجۆری مارمێلکەیە و بازێکی دیکە ئەڵێن لەنەوعی «بزن مژیە» و گۆشتی ناخورێ (دمیری ج ٢ ص ٢٤)

### ٧٠ـ [شێر]

شێر بە فارسی «شیر» و بە عەرەبی (أَسَدْ) و (ضِرْغَامْ) و (غَضَنْفَرْ)ی پێ دەڵێن، دڕندەیەکی شان و مل ئەستووری پاشوو پووتی ئازای بەهێزی شکێنەرە، لە مێژەوە بە ئازایی بەناو بانگە، پێی دەڵێن پاوشای جەنگەڵ، لەزبانی عەرەبی‌دا نێوی زۆرە.
(حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکور دڕندەیە و کەڵبەی هەیە.

### ٧١ـ [شێرۆکە سوورە]

شێرۆکە سوورە یا شێرۆکە خەناوی بەفارسی «شیر حنائی» و بە عەرەبی (اَسَدُ الحَنَاءْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی شیردەری دڕندەیە.
(حُکمْ) گۆشتی ناخورێ (اَلْقَامُوسُ العِلْمِیُّ المُصَوَّرْ)

## ٧٢- [شیرین شاهۆ]

شیرین شاهۆ، یا شینە شاهۆ بە فارسی «...» و بە عەرەبی (تَلْشُون)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی کە وەڵەی قاچ و مل درێژە، (بڕوانە خەم خۆرە) کە گوایە خەم خۆرە و شیرین شاهۆیەک باڵندەن کە بەفارسی پێی دەڵێن «بوتیمار».

(حُکمْ) حەلاڵ گۆشتە.

### باب عین

## ٧٣- [عەنتەر]

عەنتەر بەفارسی «بوزینە» و بە عەرەبی (قِرْد)ی پێ دەڵێن، مەیموونی نێر، گیاندارێکی زیرەکە، فێری کارو پیشە ئەبێ.

(حُکمْ) گۆشتی ناخورێ و حەرامە، بەلای ئیمام مالیکەوە حەرام نیە (دمیری)

## ٧٤- [عەلیشیش]

عەلیشیش، یان ئەلیشیش = بزقلەموون (بڕوانە بزقلەموون)

### باب الفاء

## ٧٥- [فەنەک]

فەنەک، وەنەک، کووشک، ڕێوی بیابان، بەفارسی و عەرەبیش (فَنَک)ی پێ دەڵێن، جۆرە ڕێویەکی بچووکە تووکەکەی نەرمە، گوێچکەی درێژە چۆلەکەو مێروو ئەخوات، وە ئەمە غەیری دەڵەکە بەتورکی پێی دەڵێن (قرساق).

(حُکمْ) حەلاڵەو گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ٢ ص ٢٢٥)

## ٧٦- [فیل]

فیل بە فارسی «پیل» و بە عەرەبی (فیلْ) وە (عَيْثُوم)ی پێ دەڵێن،

گیاندارێکی گەورەی گەرمیانیی سەرو مل قەوی‌یە، دەمی ناگاتە زەویی لوولە گۆشتێکی گەورەی درێژ بە دەمیەوەیەتی، بەوە شت کۆ ئەکاتەوە و ئەیخوا.

(حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ بە قەولی باوەڕ پێکراو، لەبەر ئەوەی کەڵبەی هەیە و خەڵک ئەکوژێ، رافیعی ئەڵێت حەڵاڵە، ئیمامی ئەحمەد ئەڵێت فیل لەخۆراکی موسوڵمانان نیە، وە بەلای ئیمامی ئەبرو حەنیفەوە مەکرووهە. (حَیَاةُ الحَیَوانْ دمیری ج ٢ ص ٢٣٤)

## ٧٧ـ [فیلە گێژە]

فیلە گێژە، بزنە کێوی، بە فارسی مشوکاە و بە عەرەبی (وَعَلْ) وە (تَیْسُ الجَبَلْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی کێوی‌یە بەقەد کەڵە کێوی‌یەک ئەبێ، دوو شاخی یەک لقی هەیە.

(حُکمْ) بە ئیجماع گۆشتی حەڵاڵە(دمیری جلد ٢ ص ٤٠٤)

## ٧٨ـ [فیسقە]

فیسقە، یان قینگ هەڵتەکێنە بەفارسی «دُم جنبانک» و بە عەرەبی (دُعَرَہ) وە (صَعْوَة) وە (عُصْفُورُ الصُّبَاحْ) وە (أُعْظُویَة)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەک پچووکی کلک درێژە هەمیشە کلکی هەڵ ئەسەنگێنێ لە چۆلەکە چکۆلەترە، ئەوە نیە بەشتی چکۆلە ئەڵێن «فیسقلی».

(حُکمی) چۆلەکەی هەیە (دمیری)

باب قاف

## ٧٩ـ [قاز]

قاز، بەفارسی «غازە» و بە عەرەبی (إِوَزْ)ی پێ دەڵێن، مەلێکی گەورەی مل درێژی دەنووک پانی پێ پەرڕەداری مەلەوانە لەمراوی گەورەترە، وەزنی تا ١٢ کیلۆ ئەچێت، مێوە قاز تا ٢٠ هێلکە ئەکات، لە پاشا ئەکەوێتە

کڕوتا یەک مانگ لەسەر هێلکە ئەبێت هەتا هەڵی تێری.
(حُکمْ) بە ئیجماع گۆشتی قاز بە هەموو جورێکیەوە حەلاڵە و ئەخورێ.

## ٨٠ـ [قازی قولنگ]

قازی قولنگ، یان قولنگ بە فارسی «کلنگ» و بە عەرەبی (کُرْکِیّ)و بە تورکی (قُرْنا)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی قاچ و مل درێژە لە شێنە شاهۆ ئەچێت، زیاتر لە لێوار ئاوەکانا ئەژی، گۆشتی خۆشە، لەکاتی باڵ گرتنەوە لەهەوادا پۆل پۆل بە شێوەی سێ گۆشە (مثلث) حەرەکەت ئەکەن، وە یەکێ لەوان هەر وەکوو فەرماندە لەسەر سێ گۆشەکا قەرار ئەگرێت.
(حُکمْ) بەبێ جیاوازی و دوودڵی گۆشتی حەلاڵە(دمیری ج ٢ص ٢٧٥)

## ٨١ـ [قاژ]

قاژ، بەفارسی «زاغ» و بە عەرەبی (غُرَابُ الزَّرْعْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکە وەک قەلە ڕەشە بەڵام ئەم لەناو «کشت و کاڵ»دا ئەژی و پێ و دەندووکی سوورە.
(حُکمْ) گۆشتی ئەخورێ و حەلاڵە (إغَاثَةُ الطَّالِبِينْ ج ٢ ص ٤٠٠)

## ٨٢ـ [قالاوە بوولێنە]

قالاوە بوولێنە، یان قەلەبانەیی، بە فارسی «کلاغ» و بە عەرەبی (غُرابْ)ی پێ دەڵێن، هەروەها (غُدَافُ صَغِيرْ) وە (رَمَادِيُّ الْلَوْنْ)ی پێ ئەوترێ، یانی خوڵەمێشی، زیاتر جڕو جانەوەرو گیاندارانی چکۆڵە شکار ئەکاو ئەیخوات ئەگەر بۆی بلوێ جووجکەی چکۆڵەیش ڕاو ئەکا، قەلە سابوونیشی پێ ئەوترێ، دەنگ ناخۆش و بۆرە لوورکە.
(حُکمْ) بەلای بەعەوی و جورجانی و ڕەویانی و ڕەمەلیوە حەلاڵە، وە بەلای خاوەنانی ڕەوضە و توحفەوە حەرامە (اعانة الطالبين ج ٢ ص ٤٠٠)

## ٨٣ـ [قالآوە رەشە]

قەلە رەشە بەفارسی «لاشخور» و بە عەرەبی (غُداف کَبیز)ی پێ دەڵێن بروانە «دال».
(حُکمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ.

## ٨٤ـ [قَر قاوڵ]

قەرقاوڵ، مریشکە کێوی، بە فارسی «تُزلگ» و بە عەرەبی (تَـذَرُو) وە (تَدرُجْ) وە (دیکْ بَریّ) پێ دەڵێن، باڵندەیەکی جوانی کلک درێژە لە کەڵەشێر ئەچێت بەلآم مەیلەو رەشەو جوانترە.
(حُکمْ) حەلآڵە و گۆشتی ئەخورێ (حَیاةُ الحَیَوانْ دمیری ج ١ ص ١٦٢)

## ٨٥ـ [قرژانگ]

قرژانگ، یان قرژاڵ بە فارسی «خرچنگ» و بە عەرەبی (سَرَطان)ی پێ دەڵێن، دەعبایەکی ناوبی چنگ چنگێ رەقی دووسەرە.
(حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ، بەلای ئیمامی مالیکەوە گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ٢ ص ٤٠٠)

## ٨٦ـ [قشقەرە]

قشقەررە، یان قەلە باچکە بە فارسی «زاغچە» و بە عەرەبی (قُـعْقُعْ) وە (عَقْعَق)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی رەش و سپی و کلک درێژە بە قونە ئەڕوا.
(حُکمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ (اعانة الطّالبین ج ٢ ص ٤٠٠، دمیری ج٢ ص١٤٨)

## ٨٧ـ [قوڕپانە]

قوڕپانە، یان قوڕی بە فارسی «جلپاسە» و بە عەرەبی (جِرْذَوْنْ)ی پێ دەڵێن، جۆرە مارمێلکەیەکە پوولەکەکانی کلکی گرێ گرێیەو سەرو ملی درکی پێوەیە.

(حُكمْ) حەڕامە چوونکە زەهری هەیە (دمیری ج ٢ ص ٢٣٢، اَلْقامُوسُ الطِبيُّ المُصَوَّرْ ص ٣١)

## ٨٨ـ [قۆڕپانە زەردە]

قۆڕپانە زەردە بە فارسی «مالُوَنگ» و بە عـەرەبی (شـامُ اَبْـرَص)ی پـێ دەڵێن، جۆرێکە لە مارمێلکە.
(حُكمْ) گۆشتی حەڕامە چوونکوو بە پیسیان زانیوە.(دمـــیری ج ٢ ص ١١ و فەرهەنگ عمید وە مەردووخ)

## ٨٩ـ [قومقومە]

قومقومە، یان قومقومۆکە بە فارسی «جانوری است شبیه چلپاسه» و بـە عەرەبی (وَزَغَةْ) پێ ئەڵێن، سەرما زەڵەوە پیس پیسۆکیشی پـێ ئـەوترێ، جۆرە مارمێلکەیەکی پچووکی سەرسێ سووچە، ناو ملەکەی کون کـونە لەکاتی ئاو لێ ڕۆکردنیا بڵقەبڵقی لێوە دێ.
(حُكمْ) گۆشتی ناخورێ وە حەڕامە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر (ص) فەرمانی کوشتنی داوە، «عَنْ سَعْدٍ (رض) اَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَ سَلَّمَ اَمَرَ بِقَتْلِ الْوَزَغَةِ وَ سَمّاها فُوَيْسِقَةْ» = واتا: سەعد (خ) گوتی: پێغەمبەر (د) فەرمانی دەدا بە کوشتنی (وەزەغە) وە ناویشی نا: لە ڕێدەرچوو واتە فاسیق)
(بێداری) لە شەرعدا چەن گیاندارێک بەلە ڕێدەرچوو (فَواسِقْ) ناو براوە لەبەر ئەوەی زیان و زەرەریان زۆرە، وە ئەمر کراوە بە کوشتنیان لەهەرکوێ بن ئەمانەش بریتین لە مار، دووپشک، مشک، قشقەرە، قومقومە (وَزَغَةْ) کە بەم پێنجە دەڵێن (فَواسِقْ خَمْسَةْ) یانی پێنج گیانداری لە ڕێدەرچوو، بازێک لە زاناکان زَغَنْ (کورکورە)[1] وكَلْبْ عَقُورْ (سەگی نیانی‌گر) یان لەم دەستە لەقەڵەم داوەیان ئاڵ و گۆڕیان کردووە. (تاج کوردی بەرگی چوارەم،

١ـ کۆلارە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (حِدَأَةْ)

فقه محمّدی، دمیری ج ۲ ص ۱۰۰ ط. مَمهد، للموس علمی مقصّوّر)
(بزانن) وەزەغ (وَزَغٌ) وە وەزەغە (وَزَغَـةٌ) جیاوازیـیان هـەیە، وەزەغ کـە بەزەغیشی پێ دەڵێن گیاندارێکە لە قورباق ئەچێت بۆ جیاوازی وەزەغ و قورباق بڕوانە کتێبی (بەمن بگوچراجلد سوّم ص ۱۵۶)
بەڵام وەزەغە (وَزَغَةٌ) کە جەمعەکەی (وَزَغٌ)ە بە قومقومە دەڵێن وە عەرەبیە
(فرهنگ عمید زیر کلمات وَزَغٌ و وَزَغَةٌ)
(ئاگاداری) بزانن لەبارەی ئێوی جۆرەکانی (سُوسْمار) لە فەرهەنگەکاندا جیاوازی هەیە، لەزۆر شوێندا یەک ناگرنەوە، بۆ وێنە مامۆستا مەردووخ بۆ عەرەبی قومقومە نووسیویەتی (حِرْذَوْنٌ) بەڵام نووسەری (قاموس عیلمی) (حِرْذَوْن)ی بە قۆڕپانەمانا لێ داوەتەوە، وە (وَزَغَةٌ) بە قومقومە، بەو بۆنەوە وام بە چاک زانی ئەوەی وا نووسەری بەناو بانگ (حسن عمید) لەبارەی جۆرەکانی (سُوسْمار)ە وە نووسیویەتی لێرەدا بینووسم هەتا کەڵکی زیاتری لێ وەر بگیرێت، مامۆستا حەسەن عەمید ئەڵێت: «مارمێلکە ـ گیاندارێکی خۆکیشە لەمار ئەچێت، دەس و قاچەکانیان کورت و کلکیان درێژ و دەمی هەراوو ددانی وردیان هەیە، مارمێلکەکان جۆریان زۆرە، جۆرێک لەوان لەنێو مـاڵ و کـون و قـوژبنی ژێـر زەویـندا ئـەژین و جڕوجانەوەر ئەخۆن کە بەمانە ئەڵێن، «چلپاسە وە مارمێلکە، جۆرێکی دیکەیان هەن لەکێو سەحرادا ئەژین لاشەیان گەورەترە بەمانە ئەڵێن «بزن مژە» جۆرێکی دیکەیان بە مارمێلکەی حەوت ڕەنگ بەناو بانگن کە لەبەر هەتاودا ڕەنگی خۆیان ئەگۆڕن، وە بە چەن ڕەنگی جۆراو جۆر خۆیان پیشان ئەدەن، کە پێیان ئەوترێ «هەتاو پەرەست» و بە عەرەبی پێی ئەڵێن (حِرْباء)، جۆرێکی دیکەیان لەنێو ئاودا ئەژین و لە لێوار چۆم و زەریادا ئەبن و لە نێو ئاودا مەلە ئەکەن و ماسی و جانەوەری دیکە ئەخۆن، جۆرێکی دیکەیان زۆر گەورەن و درێژی لاشەیان بە شەش میتر ئەگات، نەهەنگ و «گاوریال» لەم جۆرەن، بازی لە مارمێلکەکان هێلکە ئەکەن و، گەرا دائەنێن وە بازێکی دیکەیان بێچوویان ئەبێ، بەڵام ئاوبەکانیان هێلکەکەرن».

## ٩٠- [قورباق]

قورباقە، یان بۆق بە فارسی «غُوربّاغە» و بە عەرەبی (ضِـفْدَع)ی پێ دەڵێن، دەعبایەکە لە وشکانی و ئاوا دەژی، پێستێکی لینجی هەیە، پنۆک پنۆکی ڕەش و قاوەیی تێدایە، لە ئاوا «گەرا» دادەنێ، بە گەراکەی دەڵێن (سەرمێکوتە) ئەم گیاندارە لە نێوان گیانداراندا بە دەستەیەک حیساب دەکرێ کە زۆر چەشنی هەیە، بە پێودانی زانستی تا ئێستا ١١٦ چەشنی ناسراوە، ئەم گیاندارە ماددەیێک بە ڕەنگای پێستیدا لەلەشی خۆی دەردەخاکە (ژەهر)ە و بۆیە نابێ دەستی لێ بدرێ. ڕەنگە هەر بۆیەش بێ لە کوردەواریدا دەڵێن: هەرکەسێ دەست لەبۆق بدا دەستی (بالۆکەی) لێدێ.

(حُکمْ) حەرامە لەبەر ئەوەی پێغەمبەر نەهی کردوە لە کوشتنی، «عَنْ اِبْنِ عبّاسٍ (رض) قالَ: نَهىَ النَّبِيُّ (ص) عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنَ الدَّوابِّ: اَلْنَمْلَة و النَّحْلَة وَ الْهُدْهُد و اَلصُّرَد» = واتا: ئیبنو عەبباس (خ) گوتی: پێغەمبەر (د) ڕێگەی کوشتنی ئەم چوار گیان لەبەرەی نەداوە: مێروولە و هەنگ و پەپوو سلێمانکە و صوردە (التاج، دمیری ج ٢ ص ٨٦، قاموسی زمانی کوردی زەبیحی)

## ٩١- [قوون هەڵ تەکێنە]

قوون هەڵ تەکێنە، بڕوانە (فیـقە) هەندێ ئەڵێن ئەمە مەلێکی دیکەیەو لە فیـقە گەورەترە (دکتر محمّد مُکری) وە خاوەنی (قاموسی عیلمی) دەڵێ هەر دووکیان یەکن.

## ٩٢- [قومری]

قومریی، یان کۆترە باریکە بە فارسی و عەرەبیش پێی دەڵێن (قُمْرِي) - باڵندەیەکی پلپلی باریکی زۆر جوانی دەنگ خۆشە لە کۆتر بچووکترە، پشتی شینی خوڵەمێشی یە دەنووکی ڕەشە چاوی پڕ تەقاڵی یە.

(حُکمْ) حەڵاڵەو گۆشتی زۆر خۆشە جۆرێکە لە کۆتر (دمیری ج ٢ ص ٢٥٩)

## ٩٣- [قەناری]

قەناری، کەناری، مەلی دڵداریشی پێ دەڵێن بە فارسی «قناری»ە و بە عەرەبی (کناري) وە (طَيْرُ الحُبُّ)ی پێ ئەوترێ، جۆرە چۆلەکەیەکی زەردی دەنگ خۆشە لە قەفەزدا پەروەردە ئەکرێت.
(حُکمْ) لەوێنەی چۆلەکەیە.

باب کاف

## ٩٤- [کاردە پەلە]

بۆ کاردە پەلە بڕوانە (پەرڕە سێلکە) خۆمان پێی ئەڵێن تەیرمن ئەبابیل.

## ٩٥- [کەرەواڵە]

کەرەواڵە بە فارسی «کاروانکە» و بە عەرەبی (کَرَوَان)ی پێ ئەڵێن، باڵندەیەکی ئاوی‌یە لاق و دەنووکی درێژە، کلکی نیە، لە سونکە[1] بچووکترە لەکاتی فڕینیا دەنگی باڵی زۆر دێ، وە یەک سەر ئەفڕێ.
(حُکمْ) گۆشتی ئەخورێ بە ئیجماع (دمیری ج ٢ ص ٢٧٧)
(بۆ ئاگاداری) عەرەبەکان بەمە میسال دێننەوە، دەڵێن: لە کەرەواڵە ترسەنۆکترە، چوونکو هەرکات پێی بڵێن (أُطْرِقْ كَرَا إِنَّ النَّعامَةَ فِي القُرىٰ) خۆی ئەلکێنێ بە زەویدا و پارچەیەک ئەدەن بە سەریاو ڕاوی ئەکەن، ئەمە میساڵە بۆ کەسێک کە خۆی بەگەورە بزانێت و لەخۆی گەورەتر دانیشێ نۆرەی نەدات و، ئەو قسە بکات، ئەو وێنەی پێ ئەوترێ، یانێ چاوەدا خەو بێ دەنگ بە کەرە واڵە بەڕاستی «ووشتر مرە هاڵە ئاوایی ئێمە، پیاوی بێ دەسەڵات و زەعیفیان بە کەرەواڵە، وە پیاوی گەورەیان بە ووشترمەل تەشبیە کردووە.

کاتێک پیاوێکی بی‌دەسەڵات و نەزان لەبارەی باسێکی گرنگەوە

---

١- بڕوانە ژمارە ٢٧ [تەیهو] کە سونکەیشی پێ دەڵێن. (فەرهەنگی خاڵ وە هەنبانە بۆرینە)

بدوایەت ئەمەیان پێ راشەگەیان یانی ئەم باسە لە تاقەتی تۆدا نیە لێگەڕێ با پیاوی خۆی باسی لێوە بکات. (دمیری ج ٢ ص ٢٧٧، فرائدالأدب المنجد ص ٩٩٨)

## ٩٦- [کۆتر]

کۆتر بە فارسی «کبوتر» و بە عەرەبی (حَمَامَة) وە (وَرْقَاء) وە (يَمَامَة)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی جوانە لەکەو بچووکترە، وە گەلێ ڕەنگی هەیە.

(حُکمْ) حەڵاڵەو گۆشتی ئەخورێ (مغنی المحتاج ج ٤ ص ٣٠٢)

## ٩٧- [کۆترە باریکە]

کۆترە باریکە بە فارسی «کبوتر چاهی» و بە عەرەبی (وَرْقَاء)ی پێ دەڵێن، جۆرە کۆترێکی بۆری بچووکی باریکە خوێندنی لە خوێندنی کۆتری ماڵی ناچێ.

(حُکمْ) بە هەموو جۆرێکیانەوە حەڵاڵن.

## ٩٨- [کۆترە کێوییلە]

کۆترە کێوییلە بە فارسی «کبوتر کوهی» و بە عەرەبی (وَرَشَان)ی پێ دەڵێن، جۆرە کۆترێکە سەرکلکی سپی‌یە. پشتی خۆڵەمێشی یان شین یان سوور یان سەوزە.

(حُکمْ) حەڵاڵە.

## ٩٩- [کۆتری خاڵ لەمل]

کۆتری خاڵ لەمل بە فارسی «کوکو» و بە عەرەبی (فَاخِتَة)ی پێ دەڵێن، کوترێکی بچووکە بە ڕەنگی خاک، تەوقێ خاڵی ڕەش هابە دەور ملیەوە ئەڵێن گۆشتی بۆ بێ‌تینی و ئیفلیجی چاکە. (عمید زیر کلمة فاختة)

(حُکمْ) لەکتێبی (مغنی‌المحتاج) بەرگی چوارەم لاپەرە ٣٠٢دا ئەڵێ، کۆتر بە هەموو جۆرێکیانەوە حەڵاڵن چوونکوو لە شتە پاک و خاوێنەکان

(طـیّبات)ن بـەلای جـەوهەری‌یەوە تـەواوی مـەلە خـاڵ لە مـلەكـان یـا دانەخۆرەكان حـەلاڵن. لە بـاڵندە نـەناسـراوەكـاندا، وە بـەلای نـووسـەری موغنی و ئیمامی شـافیعی‌یەوە تەواوی ئەو باڵندانەی لەكاتی فرینـدا باڵ لێ ئەدەن وەكوو دەفلێدان یـان قـومە قـومە (جُـرعە جُـرعە) ئـاو ئـەخۆنەوە حەلاڵن.

## ١٠٠ـ [كوللە]

كوللە بە فارسی ملخ‌ە و بە عەرەبی (جَرادْ) وە (خَرْشَفْ)ی پی دەڵـێن، گیاندارێكی باڵداری درێژ كۆڵەی قاچ زبرە، سەوزایـی ئـەخوا، وە گـەلێ جۆری هـەیە، پـەردەیەكـی تـەنكە لەهـاوینانا بـە دەوری جـێی نـووستنا ئەگێرێ.

(حُكمْ)بە ئیجـماعی موسـولمانان خواردنی‌كوللە حەلاڵە.(دمیری ج١ ص ١٨٩)

## ١٠١ـ [كوڕكوڕ]

كوڕر كوڕر بە فارسی «اِنغرۆدە وە سنگخوارەە و بە عەرەبی (قَطاةْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەكی بچووكتر لە كەوە، تووكی لە هەموو تووكێك نەرمترە، رەنگی رەش و خـۆڵە مـیشی‌یە، لە كـێودا لەبـن درووادا هـێلانە دروسـت ئەكات، لە رێگە رۆیشتندا خاوەو ناتوانێ زۆر بفرێ.

(حُكمْ) بە ئیجـماع حەلاڵە و گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ٢ ص ٢٥٥)

(فائدة) عەرەبەكان رۆیشتنی كـوڕ كـوڕیان بـەلاوە جـوانـە، لەبـەر ئـەوەی هەنگاو نزیك دائەنێت، وە هەر وەكوو ژنان بەلەنجەو لار ئەڕۆن، لە ڕۆژی خەزای ئوحوددا (هِنْد)ی كچی (عتبە) وتی: (نَحْنُ بَناتُ طارِقٍ، تَمْشي عَلَى النَمارِقِ،، مَشْيَ القَطَا النَّوَاتِقِ. واتا: ئێمە كۆڕی كچان كچی سـتارەین «یـانی باوكی ئێمە لە شـەرەف و گەورەیی‌دا وەكـوو سـتارەی پـرشنگ دارە» بەسەر فەرشی چاكا ئەڕۆین و هەنگاو هەڵ ئەگرین، وەكوو رۆیشتنی كوڕ كوڕ كە بەلەنجەو لارەوە دڕوات و زوو زوو بەچكەی ئەبێت (دمیری ج ٢

ص ٢٥٣) وە (جامع الشَّواهد ص ٢٨٥)

وە عەبباسی کوڕی ئەحنەف وتوویەتی: بَكَيْتُ إلى سِرْبِ القَطَا إذْ مَرَرْنَ بي فَقُلْتُ وَ مِثْلي بِالْبُكَاءِ جَديرُ أسِرْبَ القَطَا هَلْ مَنْ يُعيرُ جَنَاحَهُ لَعَلّي إلى مَنْ قَدْ هَوَيْتُ أطيرُ

واتا: کاتێک پۆلی کوڕ کورەکان بەلاما ڕۆیشتن بەسەریانا گریام و پاڕامەوە، وتم گریان هەر بۆ من چاکە، ئەی پۆلی کوڕ کورەکان ئایا لە نێو ئێوەدا کەسێک هەیە هەردوو باڵی خۆی بە ئەمانەت بدات بەمن، تا بەڵکوو بۆلای ئەو کەسەی کە زۆر خۆشم ئەوێ باڵ بگرمەوە (جَامِعُ الشَّوَاهِدْ ص ٣٨)

## ١٠٢ـ [کۆر کۆرە]

کۆر کۆرە، باڵندەیەکی بۆرەقندی بێ پەرە لە کوندە بە بووی پچووک ئەچێ. (فەرهەنگی خاڵ بەرگی سێهەم لاپەڕە ١٠٣ بڕوانە (شەلاقە) ئەبێ ئەم مەلەیش شەلاقە بێ کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (سَلْوىٰ) یان شەبیهی ئەوە.

## ١٠٣ـ [کورکن]

کورکن بە فارسی مۆلکە و بە عەرەبی (وَبْرْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکە لە سمۆرە ئەچێت و لەپشیلە پچووکترە، تووکی درێژ و کلکی کورتەو گوێچکەی پچووکە، لەژێر زەوی‌دا ئەژی، ڕەنگەکەی مەیلەو خۆڵە میشی‌یە پێستەکەی بە نرخە.

(حُکمْ) وەکوو کەروێشک وایە گۆشتی ئەخورێ لەبەر ئەوەی گیاخۆرە و پاکە قاموس العلمی المصوّر وە (حَيَاةُ الْحَيَوانْ دمیری ج ٢ ص ٣٩١)

## ١٠٤ـ [کۆلارە]

کۆلارە، یان کوڕ کورە بە فارسی «گوشت ربا» وە «مرغن» و بە عەرەبی (حِدَأَةْ) وە (شُوحَةْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی گۆشتخۆری زیاندارە لە داڵ ئەچێ. (حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ، چونکوو لە (فَوَاسِقْ خَمْسَةْ)یە کە فەرمان

دراوە بە کوشتنی، پێغەمبەر (د) بە فەرمان دان بە کوشتنی پێنج گیانداری لەرِندەر چوو (فَوَاسِقْ) کە بریتین لە، مار، مشک، دووپشک، کـولارە، قشقرە، یان بە جێ ی دۆپشک قومقومە، تێمەی ئاگادار کـردوەتەوە کـە بزانین هەموو گیاندارێکی زیاندار کوشتنی رەوایە، وەکوو: بەور، پڵەنگ، گورگ، چەرخ، باشوو، شاهین، زەردەواڵە «زەنگە سوورە»، کێچ، مێرووله، مێشووله، مێش، شێر، داڵ، هەڵۆ، هەرکاتێ بێن بۆ ئینسان و ئازاری بدەن کوشتنیان سوننەتە. (دمیری ج ۱ ص ۲۳۰، مغنی‌المحتاج ج ٤ ص ۳۰۱)

## ۱۰۵ـ [کەر]

کەر، یان گوێدرێژ، یان، ئولاّغ بـە فارسی «خر» وە «الاغ» وە «دراز گوش»ی پێ دەڵێن، وە بە عەرەبی ئەوترێ (حِمَارْ)، گیاندارێکی یەک سمی بارەبەری بەسزمانی گوێ دێژە، گوێ درێژ حەیوانێکی زۆر مل کەچ و بە خزمەت و پێی بەفەرمان بەرداره، هیچ جۆرە زیانێکی نیە جگە لە خزمەتی بەشەر، ئەمانیش وەکوو بەشەکانی تری یەک سم خۆراکیان کاو جۆو گژو گیایە.

(حُكْمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ، «عَنْ جَابِرٍ (رض) قَالَ: نَهَانَا النَّبِيُّ (ص) يَوْمَ خَيْبَرَ عَنِ الْبِغَالِ وَ الْحَمِيرِ وَلَمْ يَنْهَنَا عَنِ الْخَيْلِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَ مُسْلِم» = واتا: جابیر (خ) گـوتی: لە رۆژی غەزای خەیبەردا پێغەمبەر (ص) جڵەوگیری لێ کردین لە خواردنی گۆشتی هێستر و گوێ درێژ، بەلاّم گۆشتی ئەسپ و ماینی قەدەغە نەکرد لێمان، ئەبوو داوود و موسلیم گێراویانەتەوە.

(بزانن) ئەبوو هورەیرە گێراویـەتەوە لە پێغەمبەر (د) کـە فەرموویەتی هەرکاتێ زەررەی کەرتان بیست پەنا بەخودا بگرن لەشەیتانی لەعین ئەوە شەیتانی دیوە(مسلم و بخاری) (دمیری ج ۱ ص ۲۲۹)

خودا لە قورئاندا فەرموویەتی (إِنَّ أَنْكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ) واتا: بێگومان ناخۆشترین دەنگ دەنگی زەرەی گوێ درێژە و زۆربەی

ناسازییەکەی لەبەر هێزی ئاوازەکەیەتی. سورەی لوقمان / ١٩
وە خودا لە قورئاندا مـــالی بە گوێدرێژ هێناوەتەوە، وە فـەرموویەتی «کَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَاراً» جومعە ئایەی ٥، واتا: نموونەو وێنەی سـەر سوورِ هێنەری ئەو کەسانە کە تەورات کراوە بـە باریان و تـەوراتیـان پـێ هەڵگیراوە، واتە: لە لایەنی حەزرەتی مووسـاو شـوێنکەو توانی حەزرەتی مووساوە، تەوراتیان نیشـان دراوەو، بڕیار دراوە لەسـەریان کە ڕەفتاری پـێ بکەن، کەچی ئەوان هەڵیان نەگرت و ڕەفتاریان پێ نەکرد..
وەکوو گوێدرێژەکە بارێ کتێب هەڵئەگرێ و باری سـەرپشتییەتی و بە ئازارو ئێشـەوە هەڵی ئەگرێ و ئەیبا بۆ ماڵ و شوێن و هیچ سـوودیشی لێ وەرناگرێ.

## ١٠٦ـ [کەرەکێوی]

کەرەکێوی بە فارسی «گورخر» و بە عەرەبی (حِمَارُ وَحْشِي)ی پێ دەڵێن، گیانداڕێکە لە کەر ئەچێت، ڕەنگی زەردەو خەتی ڕەشی تیایە، تا بە ئێـــستا ئەهلی نەکراوە، لە ئافریقادا ئەژی، وە کۆڕ کۆڕو دەسـتە دەسـتە حەرەکەت ئەکەن.
(حُكْمْ) حەڵاڵەو گۆشـتی ئەخورێ بە ئیجماعی زانایان (دمیری ج ٢ ص ٢٥٤)

## ١٠٧ـ [کەرکەدەن]

کەرکەدەن، یەک شـاخە، بەفارسی «کرگدن» و بە عەرەبیش (كَرْكَدَنْ) وە (وَحِيدُ الْقَرْنِ)ی پێ ئەوترێ، گیانداڕێکی زۆر زلی قـاچ و مـل ئـەسـتوورە شـاخێک وا بەسـەر لووتیەوە، لە گامێش زلترە، درێژی بەدەنی بـە چـوار میتر و بڵێندی قەدی بە دوو میـتر ئەگات، پێـستی بەدەنی کۆلوفت و ڕەش و چین و چرزک دارە، بەسـەر فیلدا زاڵ ئـەبێ، لە هـێندوستان و ئـافریقادا ئەژین، زیاتر لە کەنگاودا بەسـەر ئەبەن.
(حُكْمْ) بە زاهیر حەڵاڵە و گۆشـتی ئەخورێ چونکە دارو گەڵا ئەخوا، بەڵام ئەگەر لە نێوان ئەسپ و فیلدا لە دایک ببێ گۆشـتی حەرامە، ئەمەیش لە

عەقڵ و ژیری بە دوورە (دمیری ج ٢ ص ٢٧٢)

## ١٠٨ـ [کەروێشک]

کەروێشک بە فارسی «خرگوش» و بە عەرەبی (اَلْأرْنَبْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی تیژڕەوی کێویی دەست کورتی قاچ درێژە، گوێی وەک گوێی کەر وایە، گیاخۆرە، ماڵیی و کێویی یان هەیە، لەژێر زەوی‌دا دالانی دوورو درێژ بۆ خۆیان ئەکەن، مێوەکانیان بە هەرسکێک ٦ تا ٨ بێچووی ئەبێ و لەساڵدا چەند کەرەت ئاوس ئەبێ.
(حُکمْ) گۆشتی ئەخورێ و حەڵاڵە، (عَنْ اَنَسٍ (رض) أَنْفَجْنَا أَرْنَباً وَ نَحْنُ بِمَرِّ الظَّهْرَانِ فَسَعَى الْقَوْمُ فَتَعِبُوا فَأَخَذْتُهَا فَجِئْتُ بِهَا إِلَى أَبِي طَلْحَةَ فَذَبَحَهَا فَبَعَثَ بِوَرِكَيْهَا أَوْ قَالَ بِفَخِذَيْهَا إِلَى النَّبِيِّ (ص) فَقَبِلَهَا
واتا: ئەنەس (خ) گوتی: لە مەڕو ظەهران کەروێشکێکمان هەڵسان، پیاوەکان نیشتنە سەری تاماندوو بوون بەڵام من نیشتمە سەری تا گرتم، ئەنجا بردم بۆ ئەبوو طەلحە، ئەبو طەلحە سەری بڕی و هەر دوو سمتەکەی نارد بۆ پێغەمبەر (د) ـ یا گوتی: هەردوو ڕانەکەی نارد بۆ پێغەمبەر (د) ئەویش وەری گرت (واتە بۆ خواردن) (تاج جلد ٣ ص ٩٠. وە تـاجی کوردی بەرگی ٤ لاپەڕەی ٤. دمیری ج ١ ص ٢٠)

## ١٠٩ـ [کەڵەشێر]

کەڵەشێر بە فارسی «خروس» و بە عەرەبی (دِیکْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی جوانی پۆپنەداری دەنگ خۆشی ماڵی‌یە لە وێنەی مریشک بەڵام ئەم نێرە.
(حُکمْ) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ١ ص ٣٤٥)

## ١١٠ـ [کەمتیار]

کەمتیار بە فارسی «کفتار»و بە عەرەبی (ضَبُعْ)ی پێ دەڵێن، دەعبایەکی

کێویی‌یە یاڵ و سمی لەهی کەر ئەچێت. وتوویانە کەمتیار ساڵێک نێرو ساڵێک مێ‌یە بەڵام ئەمە ئەفسانەیە و لەڕێری دوورە.
(حُکمْ) کەمتیار حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ، ئەگەر بڵێن چۆن حەڵاڵە لە حاڵێکدا کەڵبەی هەیە، زاناکان وەڵامیان داوەتەوە و فەرموویانە هەر وەکوو ڕێوی کەڵبەی کوڵ و زەعیفە، (عَنْ جَابِرٍ (رض) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ص) عَنِ الضَّبُعِ فَقَالَ: هُوَ صَيْدٌ وَ فِيهِ كَبْشٌ إِذَا صَادَهُ الْمُحْرِمُ). واتا: جابیر (خ) گوتی: لەبارەی خواردنی گۆشتی کەمتیارە وە پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (د) فەرمووی، کەمتیاریش دادەنرێ بە نەچیر کەوا بوو گۆشتی ئەخورێ ئەو کەسەشی کەلە ئیحرام دابێ و ڕاوی کەمتیار بکا و بی‌کوژێ بەرانێکی تۆڵەی نەچیر: (فیدیە)ی دەکەوێتە سەر. (الغایةُ الطّالِبین، دمیری ج ٢، تاج جلد ٣، باقیات صالحات).

## ١١١- [کەنغەر]

کەنغەر، سێ پایلە بە فارسی «کانگورو» و بە عەرەبی (کنغر)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی گیاخۆرە لە «ئوسترالیا» ئەژی، قەدی دوو میتر ئەبێ کلکی قەوی و قاچی درێژو دەستەکانی کورتن، زۆر کات لەسەر دوو پارا ئەوەستێ لە حاڵی عادی‌دا بە چوار دەستوپا دەڕوات بەڵام لەکاتی تەنگانەدا ئەپەڕێ و بازی زۆر ئەدات، بێچوەکانی چکۆڵە و ئەندامی ناتەواوە، دایکی لە کیسەیەکدا کە لەژێر سکیدایە هەڵی‌ئەگرێ و لەوێدا شیری دایکی ئەمژێ، کاتێک ئەندامی قەوی بوو و توانی ڕێگە بڕوات دێتە دەرەوە.
(حُکمْ) حەڵاڵەو گوشتی ئەخورێ (باقیات صالحات ج ٣ ص ١٨٦)

## ١١٢- [کەنەسمە]

کەندەسمە بە فارسی «زلبورگیرە» وە «سبزکە» و بە عەرەبی (قِطْرَاقْ) وە (خُضَارِی)ی پێ دەڵێن، بڕوانە (خومەڕەژە)

## ١١٣- [كەڵك]

بڕوانە قازی قولنگ.

## ١١٤- [كەو] ژەرەژ

كەو، خاسەكەو بە فارسی «كبك» و بە عەرەبی (حَجَلْ) وە (يَعْقُوبْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەكی خاڵ و میل داری قاچ و دەنووك سووری بۆزە لە كۆتر گەورەترە.

(حُكمْ) حەڵاڵە وگۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ١ ص ٢٢٨)

## ١١٥- [كیسەڵ]

كیسەڵ، بە فارسی «لاك پشت» و بە عەرەبی (سُلَحْفَاة)ی پێ دەڵێن، دەعبایەكی دیمی‌یە وەك ڕەقەی ناو ئاو.

(حُكمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ لەبەر ئەوەی عەرەب بە پیـــان زانیوەو دڵ بۆی ناچێ و ماروشتی پیس ئەخوات، بەلای ئیبنوحەزمەوە حەڵاڵە

بڕوانە (حیاة الحیوان دمیری ج ٢ ص ٢٥)

باب گاف

## ١١٦- [گا]

گا، بە فارسی «گاو» و بە عەرەبی (ثَوْرْ) وە (بَقَرْ)ی پێ دەڵێن، ڕەشـەو وڵاخێكی نێرە كە پێ ی نایێتە سێ ساڵە.

(حُكمْ) حەڵاڵە

## ١١٧- [گا كێویی] گەوەزن

گەوەزن، یا گا كێویی بە فارسی «گاوكوهی» وە «گوزن» و بە عەرەبی (أَيِّلْ) پێ دەڵێن، گیاندارێكی كێویی‌یە لە گا ئەچێ بەڵام ئەم زلترە. شاخی گەورەو لقلقە لە نێودار و جەنگەڵدا ئەژی.

(حُكمْ) حەڵاڵەو گۆشتی ئەخورێ

(بزانن) هەندێ پێیان وایە گەوەزن خەیری گاکێویی (بَقَرْ وَحْشْ)ە بەڵام ئەبێ ئەوە بزانین گەوەزن و گاکیویی یەکێ بن یا جیاوازییان بێ بۆ ئێمە گرنگ نیە هەردوویان گۆشتیان ئەخورێ. (دمیری ج ١ ص ١٠٦)

## ١١٨- [گاکۆتر]

گاکۆتر بە فارسی «کفترکوهی» و بە عەرەبی (یَمَامَهْ)ی پێ ئەڵێن، جۆرە کۆترێکی کێوییە. ڕەنگەکەی مەیلەو سەوزە.
(حُکمْ) حەڵاڵە

## ١١٩- [گامێش]

گامێش بە فارسی «گاومیش» و بە عەرەبی (جَامُوسْ)ی پێ دەڵێن، جۆرە ڕەشە وڵاخێکی مەلەوانە، لە گاگەورەترە.
(حُکمْ) حوکمی وەکو گاو مانگا وایە حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ص ١٨٣)

## ١٢٠- [گاوانی]

بۆ گاوانی بڕوانە (ڕیشۆڵە)

## ١٢١- [گورگ]

گورگ بە فارسی «گرگ» و بە عەرەبی (ذِئْبْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی بەزیانە بە قەد سەگێک ئەبێ مێملی مەڕو ئاژاڵە، لە هەڵمەتا لەسەگ خێراترن لە ڕاوکردنا تیژڕەوترن، ئەویش هۆی ئەوەیە گورگ بەشەو و بەڕۆژ هەر خەریکی ڕاوکردنن، گورگ بە شەویش وەکوو ڕۆژ چاوی ئەبینێ هێزو توانای لە قەرارەی خۆی زیاترە، بۆنی شت ئەکات.
(حُکمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ چونکە دڕندەیە و کلبەی بەهێزی هەیە (حیاةالحیوان دمیری و مغنی ج ٤ ص ٣٠٠)

## ١٢٢- [گوێرەكە]

گوێرەكە بە فارسی «گوساله» و بە عەرەبی (عِجْلْ)ی پێ دەڵێن، ساوای یەكسالانی مانگا.
(حُكمْ) حەلاڵە وگۆشتی زۆر خۆشە.

باب میم

## ١٢٣- [مار]

مار بە فارسی «مار» و بە عەرەبی (حَيَّةْ) وە (ثُعْبانْ)ی پێ دەڵێن، دەعبایەكی درێژی بێ پێی زەهرداری بە وەزندە بەهەر گیانداریكەوە بدا زۆرتر ئەیكوژێ.
(حُكمْ) حەرامە وگۆشتی ناخورێ چونكە زەرەری هەیە و زەهری كوشندەیە و ئەمریش كراوە بە كوشتنی (دميری ج ١ ص ٢٧٥)

## ١٢٤- [مار مێلكە]

مارمێلكە بە فارسی «سوسماره» و بە عەرەبی (ضَبْ)ی پێ دەڵێن، دەعبایەكی باریكی پچكۆلەی بۆ رەقنەی چنگداری بەسزمانە
(حُكمْ) حەلاڵە وگۆشتی ئەخورێ (دميری ج ٢ ص ٧٩)
(بێداری) زۆر لە قامووس نووسەكان (ضَبْ)یان بە مارمێلكە مەعنا كردوەتەوە بەلام مامۆستا مەردووخ لە فەرهەنگەكەیدا (وَرَلْ)ی بە مارمێلكە زانیوە وە (ضَبْ)ی بە قۆرپانە مانا لێ داوەتەوە، وە لە تاجی كوردی (نوری فارس حەمە خان)دا (ضَبْ) بە بزن مژە مەعنا كراوەتەوە بەلام شوكور بۆ خودا هەركامیان بێ ئێمە هیچ كامیان ناخوێن هەر وەكوو پێغەمبەر نەیخوارد «خالیدی كوڕی وەلید (خ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (د) چووین بۆ ماڵی مەیموونەكە هاوسەری پێغەمبەر بوو، وە پووری من و ئیبنو عەبباس بوو بزنمژەیەكی برژاویان دانا بۆی، پێغەمبەر (د) دەستی درێژ كرد بۆی، ئافرەتێ گوتی: عەرزی پێغەمبەر بكەن كە ئەوە چییە كە وا

خەریکە دەیخوا ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بزنمژەیە، ئیتر پێغەمبەر (د) دەستی کێشایەوە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا بزنمژە حەرامە؟ فەرموی: نە حەرام نیە، بەڵام لەوڵاتی ئێمە نیە، لەبەر ئەوە دەبینم دڵم نایبات، خالید گوتی: جا من ڕام کێشا بوڵای خۆم و لەبەر چاوی پێغەمبەر (د) دەستم کرد بە خواردنی (تاج کوردی ج ٤ ص ٥)

## ١٢٥- [ماسی]

ماسی بە فارسی «ماهی» وە بە عەرەبی (سَمَکْ) و (حُوتْ) و (نُوْن)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی درێژ کۆڵەی پەررمداری مەلەوانی ئاوی‌یە، گۆشتی خۆشە.

(حُکمْ) ماسی بە هەموو جۆرێکیانەوە حەڵاڵن بەبێ سەربڕین و بەهەر جۆرێک مردبێت بە دەلیلی حەدیسی ڕابردوو (اُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ وَ دَمَانِ الخ) (دمیری ج ٢ ص ٣١)

## ١٢٦- [ماسی گیرە]

بۆ ماسی گیرە بڕوانە «زیقاوڵە»

## ١٢٧- [مانگا]

مانگا، بە فارسی «مادە گاو» وە بە عەرەبی (بَقَرَة)ی پێ دەڵێن، ڕەشە ووڵاخێکە کەوتبێتە سکوزا.

(حُکمْ) حەڵاڵەو لە (أَنْعَام)ە.

## ١٢٨- [مراوی]

مراوی بە فارسی «مرغابی» وە بە عەرەبی (زُمَّة) وە (غُرَّة)ی پێ دەڵێن، مەلێکی مەلەوانی دەنووک پانی پێ پەردەدارە، نێریان سەری سەوزە

(حُکمْ) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ.

## ١٢٩- [مره ڕەشتی]

مره ڕەشتیی بە فارسی «مرغ رشتی» و بە عەرەبی (غِرْغِرَة)ی پێ دەڵێن، جۆرە مریشکێکی کونجکونجی سەر پچکوڵەی دەنگ زلی دررەکە پێ ی دەڵێن مریشکی هیندی
(حُکمْ) حەڵاڵە. (دمیری ج ٢ ص ١٨٤)

## ١٣٠- [مەڕ]

مەڕ بە فارسی «گوسفند» و بە عەرەبی (غَنَمْ) وە (ضَأْنْ)ی پێ ئەڵێن، گیاندارێکی مێیینەی خوری داری دووگداریماڵی یە، کە پێ ی نایێتە ساڵی چوارەم.
(حُکمْ) حەڵاڵەو گۆشتی ناسک و لەزیزە.

## ١٣١- [مەڕە کێوی]

مەڕە کێوی، یان مەڕە سووره بە فارسی «گوسفند کوهی» و بە عەرەبی (أُرْوِيَّة)ی پێ ئەڵێن، گیاندارێکی کێوی شاخدارە، لە ئاسک ئەچێ، بەڵام ئەم نەختێک گەورەترە.
(حُکمْ) گۆشتی حەڵاڵەو ئەخورێ (دمیری ج ١ ص ٢٢)
بازی دەڵێن (أُرْوِيَّة) بزنە کێوی یەو بە مەڕە کێوی دەڵێن (غَنَمُ الجَبَلْ) بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە.

## ١٣٢- [مریشک]

مریشک = (مامر) بە فارسی «مرغ» و بە عەرەبی (دُجَاجَة) وە (فَرُّوج)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی ماڵی یە وەک کەڵەشێر بەڵام ئەم هێلکەکەرە.
(حُکمْ) حەڵاڵەو گۆشتی ئەخورێ. (دمیری ج ١ ص ٣٣١)

## ١٣٣- [مشک]

مشک بە فارسی «موش» و بە عەرەبی (فَأْرْ) وە (فَاْقِلْ)ی پێ دەڵێن،

دەعبایەکی پچکۆڵەی چوار پێی کلک باریکە، دیوار و ناوماڵ کون ئەکات.
(حُکمْ) مشک حەرامە و لە (فَوَاسِقْ)ە، مشکی ماڵی بێ یان دەشتی یان مشکە کوێرە هەر حەرام و پیسن مەگەر مشک کەروێشک (دمیری ج ٢ ص ١٩٨)

## ١٣٤ـ [مشک کەروێشک]

مشک کەروێشک، یان دوو پایلە بە فارسی «دوپا» و بە عەرەبی (یَرْبُوعْ)ی پێ دەڵێن، دەعبایەکی کێوییە لە سموّرە پچووکترو لە مشک گەورەترە، وە لە نێو کەڵەکاندا دەبێ، بە تایبەت لە هاوین و کاتی دروێنەدا لە ژێر تایەگەنمداوە لەژێر زەویدا کون بۆ خۆی دروست ئەکات و پڕی ئەکات لە گوڵە گەنم.
(حُکمْ) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ چونکە عەرەب بە پاکیان زانیوە. بەلای ئیمام (أبو حَنیفَه)وە حەرامە. (دمیری ج ٢ ص ٤٠٨)

## ١٣٥ـ [مێشە سی]

مێشەسی، کە هور وە ڕەیشی پێ ئەوترێ بە فارسی «هُوبَرَه» و بە عەرەبی (حُبَاریٰ)ی پێ دەڵێن، وە کوردی عێراق پێی دەڵێن «چێرگ» باڵندەیەکی گەورەی قاچ ومل درێژە لە بۆقلەموون ئەچێ بەگێژ و وێژی بەناو بانگە.
(حُکمْ) حەڵاڵەو گۆشتی ئەخورێ. (دمیری ج ١ ص ٢٢٦)

## ١٣٦ـ [مەیموون]

مەیموون بە فارسی «بوزینە» و بەعەرەبی (قِرَدْ) وە (سَعْدَانْ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی چوار پێی کلک‌داری گەرمیانی‌یە دەستو پێی لە دەستو پێی ئادەمی ئەچێ.
(حُکمْ) گۆشتی ناخورێ.

## ١٣٧- [نەهەنگ]

نەهەنگ یان گاماسی بە فارسی «نهنگ-گاو ماهی» و بە عەرەبی (عَنْبَر) وە (بَالْ)ی پێ دەڵێن، ماسی‌یەکی گەورەیە، سەری زل و ددانی تیژە و درێژی لاشەی بە دە میتر ئەگات، ماددەی خۆشبۆی عەنبەر کە بەناو بانگە لە مێعدە، یان ڕیخۆڵەی ئەم جۆرەماسی‌یە دایە.

(حُکم) ئەم ماسی عەنبەرانە حەڵاڵن و گۆشتیان ئەخورێ. (عَنْ جَابِرٍ (رض) قَالَ: بَعَثَنَا النَّبِيُّ (ص) ثَلاثَمِائَةِ رَاكِبٍ. وَ أَمِيرُنَا أَبُو عُبَيْدَةَ. نَرْصُدُ عِيراً لِقُرَيْشٍ. فَأَصَابَنَا جُوعٌ شَدِيدٌ حَتَّى أَكَلْنَا الخَبَطَ. فَسُمِّيَ جَيْشَ الخَبَطِ. وَ أَلْقَى الْبَحْرُ حُوتاً يُقَالُ لَهُ الْعَنْبَرُ فَأَكَلْنَا مِنْهُ نِصْفَ شَهْرٍ وَ ادَّهَنَّا بِوَدَكِهِ حَتَّى صَلَحَتْ أَجْسَامُنَا قَالَ فَأَخَذَ أَبُو عُبَيْدَةَ ضِلَعاً مِنْ أَضْلاعِهِ. فَنَصَبَهُ فَمَرَّ الرَّاكِبُ تَحْتَهُ وَكَانَ فِينَا رَجُلٌ لَمَّا اشْتَدَّ الجُوعُ نَحَرَ ثَلاثَ جَزَائِرَ ثُمَّ ثَلاثَ جَزَائِرَ. ثُمَّ نَهَاهُ أَبُو عُبَيْدَةَ. (رَوَاهُ الخَمْسَةُ إِلاَّ التِّرْمِذِيَّ تاج ج ٣ ص ٩٣)

واتا: جابیر (خ) گوتی: سێ سەد کەس بووین، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراح سەر لەشکرمان بوو، پێغەمبەر (د) ناردینی، مەنەی کاروانێکی قورەیشمان دەکرد، جا تووشی برسیتی‌یەکی سەختی وابووین، لە تاوانا بە گەڵاکوتک گەڵادارمان دەوەراندو دەمانخوارد! جا بۆیە ئەو سوپایەیان ناونا سوپای گڵادار (جەیشولخەبەط) جالەم کاتەدا دەریا نەهەنگێکی هەڵدایە دەرەوە، ناوی نەهەنگی ئاوی بوو، تا ماوەی نیومانگ لەو نەهەنگەمان دەخواردو خۆمان بە پیوەکەی چەور دەکرد، تا لەشمان باش بووەوە. گوتی: جا ئەبو عوبەیدە پەراسووێی لە پەراسووەکانی ئەو نەهەنگەی ڕاست کردەوەو پەراسوویەکی تریشی بەرابەری ڕاست کردەوەو نووکەکانی نووساندن بەیەکەوە لە چەشنی دووڵاشیانەی دەروازە، جا ئەوەندە گەورەو بەرز بوو بە ئاسانی سواری وشتر بە ژێریادە ڕۆیشت! پیاوێکمان تیا بوو ئەوکاتەی کە برسێتی زۆری بۆ هێنایین سێ وشتری بۆمان سەربڕی، دیسانەوە سێ وشتری تریشی سەربڕی، ئیتر ئەبو عوبەیدە نەیهێشت هی تر سەر بڕێ. (تاجی کوردی نوری فارس حمە خان بەرگی چوارەم

لاپەڕە ص ٩

## ١٣٨- [ئەهەنگ]

ئەهەنگ، ئەژدیها و «حەفی»شی پێ ئەوترێ بە فارسی «نهنگ بزی»ە و بە عەرەبی (تِمْساح)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی خۆکێشە (خزندە) لە مارمێلکە ئەچێت، درێژی لاشەی بە دە میتر ئەگات، چوار دەست و قاچی کورت و پەڕەدارو کلکی درێژی هەیە، دەمی (زاری) گەورە و زلە و نزیکەی ٩٠ ددانی هەیە لە نێو ئاودا مەلە ئەکات بەڵام ناتوانێ بۆ هەمیشە لەژێر ئاودا بمێنێتەوە لەوشکیدا گەرادادەنێ و لە کەنار زەریا لە نێوان لم و زیخدا قایمی ئەکات، گەراکانی (هێلکەکانی) لەدوای سێ مانگ باز ئەبێ تیمساحی ئەفریقایی زۆر جۆری مەترسیە بۆ ئادەمی هاشاوڵ ئەبات و پێستی ئەونە قەوی‌یە گوللە کاری لێ ناکات.

(حُکمْ) حەرامەو گۆشتی ناخورێ چونکو کەڵبەی قەوی‌یەو پیس و پیسخۆرە (دمیری ج ١ ص ١٦٤)

باب واو

## ١٣٩- [وورچ]

وورچ بە فارسی «خرس»ە و بە عەرەبی (دُبّ)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکە لە کوردستاندا بە زۆری لە کەژو کوێستانەکانا هەیە لە گەرمیانا نـاژی، بـە گوێرەی گیاندارە کێوی‌یەکان قەوارەی زۆر زلە وەکوو سەگ کوڵکنە بەڵام کلکی کورتە و سەری زلە چاوی کزە زۆر خۆرە دەستوێکانی وەکوو ئادەمیزاد وانە ئەگەر بەسەر بەفرا بڕوا مەگەر شارەزا بزانێ ئەوە جێگا پێ‌ی وورچە ئەگینا وا ئەزانی مرۆڤە، بەڵام نینۆکەکانی زۆر ڕەق و تیژن، بۆیە بەباشی ئەتوانێ بچێتە سەردار و میوەهاتەکەی بخوات، زوو دەستەمۆ ئەبێ ساڵان لۆتیەکان وورچ و مەیموونیان ئەهێنا هەڵیان ئەپەڕان پوولیان پێ پەیدا ئەکرد، وتوویانە وورچی (مێ) پیاوی دزیوە، وە وورچی (نێر)

ئافرەتی دزیوە لە دوای مانگی دوزراوەتەوە، وتەی پیشینیان. اکتیبی گزو گیا و ئاژەلی نووسینی میرزا صدیق جنگیانی)
(بۆ زانین) خوا لێ خۆشبوو مامۆستا مەلا حەسەنی دزلی (م: ۱۳۲۳ قە) شێعرێکی تێکەلی هەیە زۆر خۆشە بەو بۆنەوەکە باسی ئەوە ئەکات وورچ لەکوردستان بە تایبەت کوێستاندا زۆرە ئاماژەم بەمە کرد
دەڵێت
إنّي لَفي جِبالٍ فيها مەغارو ورچ
قَدْعَضَتِ الكِلابُ مِنْ كِلْكِها مِراراً
بۆ خۆم دەژیم بە سەربەست باکی زکس ندارم
أَتَغَنَّسُ وَ أَمشي كَالدُّبِّ في الصَّحارىٰ.
تا ئاخر

واتە: من لە کەژو کێودام لانە ورچی تێدایە کە چەند جار سەگ قەپی لەکلکی گرتوە. بۆ خۆم بەسەر بەرزی دەژیم و باکم لەکەس نیە سنگ دەر دەپەڕێنم و ئەڕوم وەک چۆن ورچ لە دەشتدا ئەڕوا (بڕوانە گۆڤاری «اصحاب انقلاب» ژ ۳۰ ص ٤٥)
(حُكمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ چونکوو کەلبەی قەوی یە و درندەیە (دمیری ج ۱ ص ۳۲٦)

## ۱٤۰ـ [وشتر]

ووشتر بە فارسی «شُتُر» و بە عەرەبی (جَمَلْ) و (بَعیرْ) و (نـاقَة)ی پێ دەڵێن، گیاندارێکی چوار پێ ی تووکنی پێپانی قاچ و مل درێژی بەهێزی بارەبەرە
(حُكمْ) حەلاڵە بە نەصّی قورئان و ئیجماعی ئوممەت (أُحِلَّتْ لَكُمْ بَهيمَةُ الأَنْعامِ = واتە حەلاڵ کراوە بۆ ئێوە ئەنعام کەبریتین لە ووشتر و بزن و مەڕو گا) (دمیری ج ۱ ص ۱٦)

## ١٤١ـ [وشتر مر]

وشتر مر بە فارسی «شُتُر مُرغ» و بە عەرەبی (نَعامَة)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی گەرمیانی گەورەی مل درێژە لە وشتر ئەچێ.

(حُكمْ) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ بە ئیجماع (دمیری ج ٢ ص ٣٥٨)

## ١٤٢ـ [واق واق کەرە]

واق واق کەرە بە فارسی و عەرەبی (وَاق)ی پێ دەڵێن، مەلێکی کاکۆڵدارە ماسی ئەخوات وە ئاوی‌یە پشتی سەری پەڕی نەرمی پێوەیە بە زۆری ڕەنگی سپی‌یە و کلکی کورتە لەشێنە شاهۆ ئەچێت. بە ڕۆژ لەناو قامیشەڵان و زەلرا خۆی ئەشارێتەوە بە شەو ئەخوێنێت. وە واق واق ئەکات، ناوەکەی لە دەنگیەوە وەرگیراوە.

(حُكمْ) حەڵاڵە و گۆشتی ئەخورێ (دمیری ج ٢ ص ٣٩٠)

## ١٤٣ـ [وەی وەی کەرە]

نێوی ئەم باڵندەیەش لە دەنگیەوە وەرگیراوە، گۆیا لە خوێندنیا دەڵێت وەی وەی نێوی فارسی و عەرەبی ئەم باڵندەیەم بۆ نەدۆزراوە هەتا حوکمەکەی بنووسم بەڵام بیستوومە جووره قازڵاخی کە لە پیتی (ج) جیمدا باسی لێوە کراوە وەی وەی دەکات ئەبێ هەر جۆرە بێ کە بە فارسی «چکاوک» و بە عەرەبی (قُبَّرَة) و (قُنْبَرَة)ی پێ دەڵێن، نێوی وەی وەی کەرەم تەنیا لە کتێبی (فرهنگنامهای پرندگان دکتر مکری) بەرچاو کەوت کە بە شێوەی وەچکە وەی وەی نووسراوە.

باب هاء

## ١٤٤ـ [هۆهۆ کەرە]

هۆهۆ کەرە بە فارسی «بوم» و بە عەرەبی (خَبَل)ی پێ دەڵێن، جۆرێکە لە کوندە بەبوو.

(حُکمْ) حوکمی بایەقوشی هەیە بروانە (بایە قوش) (فرهنگ مردوخ، القاموس العلمی المصوّر)

## ١٤٥ـ [هەڵۆ]

هەڵۆ بە فارسی «عقاب» و بە عەرەبیش (عُقَابْ)ی پێ دەڵێن باڵندەیەکی ڕاوکەری درری گۆشتخۆری تیژ باڵ و بەرزە فڕی بەرزە نشینە

(حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ، چونکوو چنگۆڵی بەهێزە و ڕاوکەرە (دمیری ج ٢ ص ١٣٠)

## ١٤٦ـ [هەلەکە سەما]

هەلەکە سەما: مشکگرە بە فارسی «طوعی عقاب» و بە عەرەبی (عَوْسَقْ)ی پێ دەڵێن، باڵندەیەکی گۆشتخۆری چنگ زەردی قاچ کورتە ناتوانێ لەسەر زەوی ڕاو بکات بەڵکوو بە حەواوە ئەیکات.

(حُکمْ) حەرامە و گۆشتی ناخورێ (فرهنگ خال و قاموس علمی مصوّر)

شوکر و سوپاس بۆ خودا لێ بورمەوە لە نوسینی ئەم کتێبە لە مێژووی ڕۆژی جمعە ١٣٧٥/٦/٣٠ هەتاوی لە ئاوایی لەگزی سەر بەشاری سەقز

محمود ئیبنولخەییات (ابن الخیّاط)

وَ الْحَمدُ لِلّٰهِ اَوَّلاً وَ آخِراً وَ سَلامٌ عَلیٰ عِبادِ اللهِ الصّالِحِینْ

## ناوەرۆک

## سەرچاوەكان

١ـ تەفسیری نامی مامۆستا مُدَرِّس
٢ـ اَلتَّاجُ الْجامِعُ لِلاُصُولِ فِی أَحادِیثِ الرَّسُولِ عَلی ناصِفْ ج ٣
٣ـ تاجی كوردی نوری فارس حەمەخان بەرگی چوارەم
٤ـ شەریعەتی ئیسلام مامۆستا مُدَرِّس، بەرگی، یەكەم
٥ـ فِقْهُ السُّنَه السَّیِّد سابق لەگەڵ وەرگێڕاوەكەی دوكتور مەحموود ئیبراهیمی بەرگی چوارەم
٦ـ باقیات صالحات مامۆستا ڕەبیعی بەرگی ٣
٧ـ فقه محمّدی شیخ محمّد مردوخ آیة الله كردستانی جلد ١
٨ـ اَلْحَلالُ وَ اَلْحَرامُ فی اْلاسْلامِ دكتر یوسف قرضاوی لەگەڵ وەرگێڕاوەكەی مامۆستا حەسەنزادە
٩ـ گزوگیا و ئاژەڵ میرزا صدیق احمد جنگیانی
١٠ـ فرهنگ‌نامهای پرندگان دكتر محمد مُكری
١١ـ مُغْنِیُ الْمُحْتاجْ فِی شَرْحِ الْمِنْهاجْ جلد ٤
١٢ـ اعانَةُ الطّالِبین جلد ٢
١٣ـ اَلْأَنْوارْ یوسف اردبیلی جلد ٢
١٤ـ حَیاةُ الْحَیَوانْ دمیری هر دو جلد
١٥ـ اَلْقامُوسُ الْعِلْمِیُّ الْمُصَوَّرْ تألیف كمال جلال غریب
١٦ـ فرهنگ حسن عمید ٢ جلدی
١٧ـ قامووس زەبیحی جلد اوّل الف و ب
١٨ـ فرهنگ مردوخ ٢ جلدی
١٩ـ فرهنگ بابان ١ جلدی
٢٠ـ فەرهەنگی خاڵ ٣ جلدی
٢١ـ تسهیل المسائل سیّد محمود حسینی‌نسب جلد ٣
٢٢ـ تَفْسیرُ الْمُنیرْ دكتر وَهْبَةُ الزّحیلی جلد ١٠
٢٣ـ اَلْفِقْهُ الْاِسْلامِیُّ وَ أَدِلَّتُهُ = ج ٣

«تەواو بوو»

